ناوی کتێب: فێربوونی تەکنیك و هونەری ئاخافتن!!
نووسینی: گوندۆلا هیرش
وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: برایم فەرشی
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٦٥٢
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مەریەم موتەقییان
هەڵەگری:  شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
چاپی یەکەم، هەولێر – ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٩٥٦)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## چەند گوتەیەکی پێویست

ئـایـا لـە خـوێـندنـگـە و لـەنـاوپـۆڵدا، کـاتـی قسەکردن یـان وەڵامدانـەوەی وانــەکــانت، هــەست بــەشەرم یــان تـرس دەکـەی؟ ئـایـا لـەگـەڵ دۆست و هـاوکارەکانت لە شوێنی کار، هەست بەوەدەکەی کە لە قسەکردن لەسەر بـابـەتێك و گێڕانـەوەی بـاسێك،ڕاحـەت نی و بۆت ئـاسان نییە؟

ئایا لە میوانی و کۆڕ و کۆمەڵدا دەتوانی بەئاسانی بیر و باوەڕی خۆت بـاس بـکـەی و بـەرامـبـەرەکـەت لـە بـیـروبـاوەڕی خـۆت تـێ بـگـەیـنـی؟ ئـایـا دەتوانی مەبەستی خۆت بگوێزیەوە سەر کاغەز و پاشان پێشکەشی خەڵکی بکەی؟ ئایا دەتوانی لە زمان بۆ دەربڕینی بیر و فکر و هەستی خۆت، بەباشی کەڵك وەرگری؟ ئایا لەکاتی قسەکردندا بۆ پەیداکردنی وشەی بەجێ دادەمێنی؟

ئەگەر یەك لەو پرسیارانە تۆ بگرێتەوە، ئەوە ئەو کتێبە و وانەکانی ڕاست بۆ تۆ ئامادەکراوە. لە ڕێگای فێربوونی وانەکانی ئەو کتێبەوە، گیروگرفتی قسەکردن و ئاخافتن و وتاردان، سمینارگێڕانت، چارەسەر دەکرێ و ترس لە قسەکردن لە خۆت دووردەکەیەوە.

هەرکەس و هەموو کەسێك دەتوانێ لەم کتێبە سوود وەرگرێ، خوێندکار و مامۆستا، هونەرمەندانی شانۆ- سینەما - تەلەفزیۆن - سیاسەتمەدار، وێژەر، گۆرانیبێژ، کارمەند، تاجر و هەرکەسێکی دیکە، بۆی هەیە لە ڕێگای ئەنجامدانی ڕاهێنانەکانی ئەم کتێبەوە خۆی وەك قسەکەرێکی باوەڕبەخۆ، باش ڕاهێنێ.

هـونـەر و تـەكـنـيـكـی نـووسـيـن وتـار ئـامـادەكـردن، چيرۆكنـووسـيـن و خوێندنەوەی، شيعر خوێندنەوە، ڕاهـاتن لەگەڵ دەنگ و تۆن، ڕاهێنانی لەش و خۆئـامـادەكردن بۆ دەركەوتن لە بەرامبـەر كۆمەڵە كەسێكدا، تەكنيك و هونەری دەنگ و سيستمی دەنگ و مۆسيقای دەنگ و زۆر بەشی تر وانەكانی ئەم كتێبە پێك دەهێنن.

هـەرچەند كتێبەكە بـەزمـانـی ئـەڵمـانـی نووسراوە و نموونـەكـانـی لـە شيعر و چـيـرۆك و ئـەدەبـيـات و هـونـەری ئـەڵمـانـی پـێك هـاتـوون، بـەوحـاڵـەش كتێبەكە لە زمـان و ئـەدەبيات و پێداويستييەكانی خوێنەری كورد نزيك كـراوەتـەوە، بـەچـەشنـێك كـە خـوێنـەری كـورد دوور لـە گـرێ و گـيـروگـرفـت بتوانێ كەڵكی لێ وەرگرێ. بەشێك لە ڕوونكردنـەوەكـان لـە دوو كـەوانی گۆشەداردا دانراون كە وەرگێڕ لێی زياد كردوون.

نووسين و وەرگيرانی ئەم كتێبە، تەنيا لەبەر ئەو هۆيانەی سەرەوە نييە، نـووسـەری ئـەم دێرانـە لـە مـاوەی سی سـاڵ بـەڕێوەبـردنـی كـۆرسـەكـانـی شانۆگەری و شانۆ پێداگۆگی و كۆمۆنيكاسيۆن، بۆی دەركەوتووە كە ئەمە گرفتێكی جيهانييە كە ئينسان لەگەڵی ڕووبەرووە و لە هەر وڵاتێك و لە نـاو هـەر ميللـەتێكدا سەرەڕای جياوازی لە هەموو بوارەكاندا بەدی دەكرێ، بەشی هەر زۆری ئەو كەسانەی كە لە كۆرسەكانی مندا بەشداريـان كردووە كـێشەی وەك كـوردسـتـانـيـان نـەبـووە، بـەڵام تـرس و شـەرمـيـان هـەبـووە و كۆمەڵگای سەنعەتی (پيشەسازيی) و سوپر كۆمۆنيكاسيونيش نەيتوانيوە ئەم گرفتە ئينسانييە چارەسەر بكات.

لێرە بەهـەمـان ئەندازە كە كۆمەڵگا پێشدەكەوێ، قسەكردن لە جێگايـان دژوارتر دەبێ و قسەكەر پسپۆريی زۆرتری گەرەكە، ديارە هەموو كەس نە ئەو پسپۆرييەی هەيە، نە لە تەكنيك و ميتۆدە پێشكەوتووەكانی قسەكردن شارەزايە، هەر بۆيە فێربوونی تەكنيك و هونەری ئاخافتن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەبـێـتـە پـێويستـيـيـەكـی كـۆمـەڵگـا، كـە ئـەمـەش خـەڵكـی وڵاتـی ئـێمـە،

کوردستانیش دەگرێتەوە.

لەبەر کۆمەڵێك هۆی گشتی و تایبەت، کتێبی ″فێربوونی تەکنیك و هونەری ئاخافتن″، بۆ هاووڵاتییانی کورد ئامادەکراوە. هیوادارم بتوانین کتێبەکانی تری ئەم زنجیرەیە لە داهاتوویەکی نزیکدا بگەیەنینە دەست خوازیاران.

سوپاس بۆ دەزگای ئاراس لە شاری هەولێر و هەموو ئەو دۆستانەی هەلی چاپی ئەم کتێبەیان رەخساند.

برایم فەرشی

## چۆن لەم کتێبە کەڵك وەرگرین؟

ئەم کتێبە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە تەکنیکی هونەری ئاخاوتندا لاوازن، خەڵکێکی زۆر هەیە کە بەزەحمەت دەتوانن ئەوەی کە مەبەستیانە بیهێننە سەر زمان، کەسانێك هەن کە بۆ هێنانە سەر زاری چەند ڕستە، دووچاری دڵەکوتە و هەناسە سواری دەبن و هێزی دەروونیی تەواو بۆ ئەم کارە لەخۆدا نابینن کە دوور لە کەسانی نزیك و لە ناو کەسانێکی نەناسراودا ئەوەی کە دەیانەوێت دەری ببڕن. ئەم جۆرە کەسانە پێویستیان بەیارمەتی هەیە ئەو هێزە دەروونییە پەیدا بکەن بۆ ئەوەی، دوور لە ترس و دڵەکوتە، ئەوەی دەیانەوێت بیهێننە سەر زمانیان.

هەروەها کەسانێك هەن کە زۆربڵێن و بەپەلە قسە دەکەن و مێشکی سەری کەسانی دی دەبەن و خۆیان دووچاری گۆشەگیری و تەنیایی دەکەن و لە دەروونی خۆیاندا هەست بەدڵنیایی ناکەن.

دەستەی سێیەم ئەو کەسانەن کە حەوسەڵەی قسەکردنیان نییە و حەز دەکەن بێدەنگ و بێ قسە بمێننەوە و نایانەوێ لەناو خەڵکدا دەرکەون و بچنە پێشەوە، ئەو کەسانە قەت لە ناو کۆمەڵێك کەسدا قسەیان نەکردووە.

ئەم کەسانە کە باس کران دەتوانن بەباشی کەڵك لەم کتێبە وەرگرن و گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن و ئیسباتی بکەن کە دەکرێ فێری قسەکردن بێ.

شاگردەکانی کۆرسی قسەکردن [وتار بێژی، وێژەری] لە سەرەتادا وا دێنە بەرچاو دەستەکانیان لە ئارەقەدا دەخوسێ، چۆکیان دەلەرزێ، گەروویان وشك دەبێ، زمانیان وا قورس دەبێ کە بۆ سووڕان ناشێ. مرۆڤ ڕەنگە قسەگەلێك بکات کە مەبەستی نەبووە، ئەم نیشانانە دەکرێ هێدی هێدی نەمێنن و لە ناوبچن، ئەگەر زۆرتر و زۆرتر کار لەسەر قسەکردنمان بکەین و تواناکانمان بەکاربهێنین.

بەیارمەتیی ئەم کتێبە ئەو گیروگرفتانەی کە لە کاتی قسەکردندا دێنە پێش چارەسەر دەکرێ، ئەویش زۆر بەخێرایی میتۆدەکانی ئەم کتێبە لە ناو کەسانی جیاوازدا کە پیشە و کاری جیاوازیان هەیە، بەتاقی کراونەتەوە، وەك خوێندکاران، دکتۆرەکان، وەکیلەکان، تاجرەکان، ژنانی ماڵێ، سکرتێرەکان، مامۆستایانی باخچەی منداڵان، پیشەکارانی ئازاد، مامۆستاکانی فێرگەکان، فرۆشیارەکان، دایك و باوکەکان، بەرپرسانی دەستە و گرووپەکان، نوێنەرانی پەرلەمان، مامۆستایانی پیشەکار، بەرپرسانی بەشی تیجارەت، پەرستارەکان، خوێندکارانی زانکۆ، سیاسەتمەداران و کەسانی دی.

## لە خوێندنەوە تا کارکردن

ئەو کەسەی کە دەیەوێت خۆی بۆ باش قسەکردن ڕابهێنێ، گەلێك مەرجی تایبەتی خۆی هەیە. هەر بەپێی ئەو مەرجانە هەر کەسێك بەشێوەیەك لەم کتێبە دەڕوانێت. یەکێك دەیەوێت لاپەڕەکانی هەڵداتەوە و سەیری بەشەکان بکات و بیخوێنێتەوە تا دواجار بەشێوەی بەردەوام بەتەنیا و یا لەگەڵ کەسانی دی کە ئەوەیان زۆر باشە، بکەوێتە کارکردن و خۆفێرکردن.

کەسێکی دی ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ کەسانێکی دی یەك بگرێ و لە ناو گرووپێك بەیەکەوە بەردەوام کار لەسەر بەشەکان، واتە وانەکان بکەن. ئەم ڕێگایە گەلێك بەسوودە، لەبەر ئەوە ئەندامانی ئەم گرووپە لە یەکترەوە فێر دەبن و تاك لە ناو ئەو کۆمەڵەدا هەر لە سەرەتاوە گیروگرفتەکانی چارەسەر دەکات. لەبەر ئەوەی وانەکان بەشوێن یەکدا دێن باشتر وایە بەپێی سیستمی کتێبەکە و وانەکان کار بکرێ و لە وانەی یەکەوە دەست پێ بکرێ. لە درێژەی وانەکاندا ڕووبەڕووی ئەو تێکستانە دەبنەوە کە مەسەلەی سیاسی ڕۆژانە دێنێنە گۆڕێ. دەبێت بەدروستی ئەوە لە بەرچاو بگرن کە نابێ خۆتان بۆ لایەك راکێشن کە ببێتە هۆی دروستکردنی بیروباوەڕی یەك لایەنەی سیاسی.

وانەی ١

## قسەکردنی ئازاد و بوێرانە

خەمی ئەوە مەخۆ کە، ئەو شەپۆلانەی کە لە لایەن تۆوە دەچێتە ناو خەڵك، بگەڕێنەوە. ئەوە، زۆر گرینگ نییە. قسە بکە بێ ئەوەی خەمی کاردانەوەیان لە ناو خەڵکدا بخۆی، بێ ئەوەی خەمی خەڵکت بێ، بێ ئەوەی بیر لە هەوای هۆڵەکە بکەیەوە، بەردەوام قسە بکە، خوای من بۆخۆی جەزای تۆ دەداتەوە.

### [کورتتو خلۆسکی، ڕێنمومایی بۆ قسەکەرێکی خراپ]

قسەکردنێکی ئازاد، ئازاد قسەکردن ئەرکێکی پڕ لە تین و گەرمایە. کام ئیمکانی چاوەڕوان نەکراو بۆ کەسێکی ئاوا هەیە، کە دوور لە خەم و ترس قسە بکات! ئەو ئەم پرسیارە لە شاعیر دەکا، هەست دەکات کە ئەوە تەئیدی قسەکانی دەکات کە دەڵێ: «قسە بکە بێ ئەوەی گوێ بدەیە حاڵ و هەوای هەوای هۆڵ، بەردەوام قسە بکە خوای من»، پاش ئەوەی بەجیددی سەرنج دەدا و بیری لێ دەکاتەوە، بۆی دەردەکەوێت و هەست بەهەڵەکەی خۆی دەکا کە ئەوە پێشنیاری شاعیرە بۆ قسەکەرێکی خراپ. هەموو ئەو شتانەی کە لە خەیاڵی دابووە و ئارەزووی کردووە بەوجۆرە لە بەریەك بڵاودەبنەوە.

بیر لەوە بکەنەوە کە ئێوە دەتانەوێ قسە بکەن، و ئامانج ئەوەیە کە گوێگر بکێشرێتە ناو باسەکەوە. ئەگەر قسەکە مەنەلۆگێکی دوور و درێژبێ، دیوارێکی لە نێوان ئێوەی قسەکەر و گوێگردا دەکێشرێ و گفتوگۆ و دیالۆگ پێکنایە و سەرئەنجام دەبێتە جێگای داخ. هەر بۆیە گەلێك گرینگە، وێژەر، قسەکەر زمانێکی ئامانجدار بەکاربێنێت بۆ ئەوە بتوانێت پەیوەندی لەگەڵ گوێگر ساز بکات، بۆ ئەوە سەرنجی گوێگر لە ڕێگای زمانەکەیەوە بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. ئەم مەسەلەیە بەو ڕادەیە گرینگە کە وێژەر و قسەکەر، لە کاتی قسەکردنی بێ پەردە و ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵکدا، یا لە ڕێگای

ئامرازی ڕاگەیاندنەوە، دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە ئایا باشتروایە بە زمانی بالای ئیستاندارد قسە بکات، یان بەزاراوە یان بەزمانێکی ڕەنگینی تێکەڵ لەگەڵ زاراوەکان.

## چۆنییەتی ڕواڵەتی وێژەر، قسەکەر

زۆربەی بەشدارانی کۆرسی قسەکردن، کاتێك ڕووبەڕووی جەماوەرێکی زۆر دەبنەوە، بۆ قسەکردن، گرفتی جیدی لەگەڵ لەشی خۆیاندا پەیدا دەکەن و نازانن چۆن لەگەڵ لەشی خۆیان لە کاتی قسەکردندا هەڵسوکەوت بکەن. ئەو کەسانە لە ڕێگای لەشی خۆیانەوە لە بەرامبەر جەماوەری گوێگر و بینەردا، وێنەیەك لە خۆیان دەدەن بەدەستەوە کە دەبێتە هۆی پرسیار لە ناو خەڵکدا، وێژەرێکی چەماوە، وێژەرێکی دوودڵ قسەکانی بەفیڕۆ دەچن.

یەکێك لە نیشانەکانی وێژەر و قسەکەری سەرکەوتوو، ئەوەیە کە ڕواڵەتی لە کاتی قسەکردندا بکەوێتە بەرچاوی خەڵك و ڕەنگی تێك نەچێ و قسەی نەبزرکێ چونکە ئەمانە نیشانەی دوودڵی و بێ باوەڕین بەخۆ.

بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو ئەو گیروگرفتانەدا، دەبێ هەموو بەشەکانی ئەم کتێبە بە تەمرین و مەسەلەکانییەوە بەجیدی وەربگیرێ و کاری لەسەر بکرێ و چالاکانە بەکاربهێندرێ، لەبەر ئەوەی ئەم وانانە ئێوە بەرەو باوەڕ پەیداکردن بەخۆ، ڕێنمایی دەکا کە چۆن سەرکەوتووانە لە بەرانبەر بینەر و گوێگردا دەرکەون. وا دەردەکەوێ کە زاڵبوون بەسەر لەشی خۆدا، بۆ زۆر کەس کێشەیەکی جیدی بێت. لە خۆتان ئەو پرسیارە بکەن: لە کاتی قسەکردندا چی بکەم لە دەستەکانم؟

ئێوە هەوڵ دەدەن بۆ ڕزگاربوون لە دەستی دەستەکانتان، دەستەکانتان بەگیرفانی شاڵوارەکەتاندا کەن یان هەردووکیان لە پێشەوە لەگەڵ یەك گرێ دەن. ئەمە چارەسەرێکی پڕ بایەخ نییە.

چـــاودێری کـــردنـــی بـــەشدارانـــی کـــۆبـــوونـــەوەی دایك و بـــاوکـــان لـــە خوێندنگایەك:

مـامۆسـتـا، دیـتـە پێشەوە، لە کاتێکدا دەستێکی وەك مست لە نزیك سینگی ڕاگرتووە و دەستەکەی دیکەی بەهـەمـان شێوەی قوچاو بۆ لای دەستەکەی نزیك سینگی دەهێنێ و پێیوایە بەم جۆرە متمانە و باوەڕبەخوبوونی نیشان داوە.

ئەم وێنەیە بۆ دەروونناسێکی شارەزا نیشانەیەکی دیار و ڕوونە بۆ دەربـڕیـنـی بـێ بـاوەڕی بـەخـۆ و دوودڵـی. هـەمـان شتـە ئـەگـەر ئـەو کـەسـە نیوقەد بنوشتێتەوە یان بچەمێتەوە. ئێوە دەتوانن لە ڕێگای باسەکەوە [ئـــەنـیشك بــۆ لای دەست] پشتـیـوانـی لـە لـەشی خـۆتـان بـکـەن و پـێش بەڕووخان و چەمانەوەی لەش بگرن.

دەرکەوتن لە بەرامبەر خەڵکدا، وەك وێژەر و قسەکەر و وتاربێژ، کارێکی دژوارە، تەنانەت دژوارترە لە قسەکردن، لەبەر ئەوە ترسی قسەکەر لە قاو دەدرێ و کاردەکاتە سەر قسەکردنەکەش.

ئـــەوەی ئـــایـــا دوو دەستـــی لـــە یـــەك هـــالاو، یـــان لـــە پشتـــەوە شاردراوە، ئیمکانێکە بۆ هەست بەئازادی کردن و کراوەبوون، جێگای پرسیار نییە، لەبەر ئەوە، ئەو دوو دەستە دەبێ لە پێشدا لەو حاڵەتە بێ دەرەتانی و سەرگەردانییە ڕزگار بکرێن.

## پڕۆڤە بۆ زاڵبوون بەسەر لەشدا

هـەستنە سەر پێ بەچەشنێك لە ناو ژوورەکەدا هەر چوار دەورتان ئازاد بێ، بێ ئەوەی پاڵ بەشوێنێکەوە بدەن.

* قـورسایـیـی لـەش بـەشێوەیـەکـی هـاوسەنگ، بـەسەر دوو لاقدا دابـەش دەبێت، کە تەنیا چەند سانتیمەترێك لە یەك doorn، دوو لاق هێندە لە

یەك دووربن کە بەلای تەنیشتدا نەکەون و لە کاتی پێویستدا بتوانن قورساییی خۆتان بۆ لای ڕاست یان چەپ بگوێزنەوە. لە درێژەی ئەم باسەدا بۆتان دەردەکەوێ کە ئەم حاڵەتە وەك حاڵەتی دەسپێك و حاڵەتی پایە حیسابی بۆ دەکرێ.

* بۆ ئەوەی بۆتان دەرکەوێ، قۆڵ و باسکی خاو و ئازاد چۆنە، هەردوو باسکتان بۆ پێشەوە درێژکەن و لێ گەڕێن، هەردووك دەستتان شل و قورس داکەوێنە خوارێ. [لەش نابێ لەگەڵ هاتنە خوارێی دەستەکان بچەمێتەوە] تەنیا بەقۆڵ و باسکی شلەوە بۆتان هەیە، نیشانەکانی زمانی لەش، لە ڕێگای بەکارهێنانی دەستەکانتانەوە بۆ نەقشاندنی وشەکان بەکاربهێنن. دەستی شاردراوە لە پشتەوە و یان گرێدراو لە پێشەوە زەحمەتە بۆ نیشاندانی ئاگایانەی نیشانەیەك کە مەبەستی ئێوەیە، بەکاربهێندرێ.

بەپێی ئەم حاڵەتە بنەڕەتییە، واتە ڕاوەستانی ئازاد کە قورسایی بەشێوەیەکی هاوسەنگ بکەوێتە سەر هەردوو لاق و دەست و قۆڵ شل و ئازاد بن، ئەم دوو پرۆڤەی خوارەوە بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی قورساییی لەش، ئەنجام بدەن و بیر لەوە بکەنەوە ئەم حاڵەتە چ کارتێکردنێکی لەسەر بەرامبەرەکەتان واتە [ئەو کەسەی لەگەڵ ئێوە کار دەکات] هەیە.

**ئیمکانی یەك:**

بەپێی ئەم بنەما بنەڕەتییە کە لەسەرەوە باس کرا، ئێوە بەلاقێکتان هەنگاوێکی گچکە دەگەڕێنەوە دواوە.

قورساییی لەش، هاوکات لەگەڵ پاشەکشە بۆ دواوە دەکەوێتە سەر ئەو لاقە کە کشاوەتەوە دواوە.

پێتان وایە ئەم گۆڕینی پۆزیسیۆنە (دۆخ)، چ کارتێکردنێك لەسەر گوێگر [بینەر] دادەنێ؟

ترس، گەڕان بەشوێن جێگایەکدا بۆ پاڵ پێوەدان و خۆپاراستن، ئەمە بەڕوونی دەکەوێتە بەرچاوی خەڵك و ئەو هەستە لەودا پێك دەهێندرێ. قسەکەر بەو کارە خۆی دەخاتە پۆزیسیۆنێکەوە کە پۆزیسیۆنی دەرچوون و ڕاکردنە. واوێ دەچێ کە ئەو کەسە باوەڕی بەخۆی دۆڕاندبێ. ئەو بەو شێوەیە هێزی باوەڕ بەخۆی لە دەست دەدات و ناوەڕۆکی قسەکانی ئیتر لای خەڵك حیسابیان بۆ ناکرێ. سەرجەمی کارتێکردنی قسەکانی ئەم قسەکەرە، لەسەر خەڵك، دەکرێ بەنیگاتیڤ لە قەڵەم بدرێت.

**ئیمکانی دوو:**

هەر بەپێی قسەکانی سەرەوە ئەمجار ئێوە هەنگاوێکی گچکە بۆ پێشەوە هەڵهێننەوە، ئێستا قورسایی لەش دەکەوێتە سەر ئەو لاقە کە لە پێشەوەیە.

پێتان وایە گۆڕینی ئەم پۆزیسیۆنە چ کارتێکردنێکی لەسەر گوێگر (بینەر) دەبێت؟

قسەکەر بۆ لای گوێگر دەکێشرێ، وێ دەچێ باوەڕی بەخۆی و قسەکانی پتەو بێت، مرۆڤ دەتوانێ هەست بەوە بکات کە قسەکەر بۆ لای جەماوەر دێت و کراوەیە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکدا. بەگشتی دەکرێ بگوترێ کە کارتێکردنێکی پۆزێتیڤی لەسەر گوێگر هەیە، هەرچەند دەکرێ بۆچوونی قسەکەر هێرش کارانەش لە قەڵەم بدرێ.

## سەرئەنجام

ئەگەر لە کاتی قسەکردندا پێتان وابێ پێویستە و دەبێ قورسایی لەش بۆ پێشەوە بگوێزنەوە، دەبێ ئەوەش بزانن ئەم جێگۆڕکێیە زەحمەت دەنوێنی بۆ ڕاگرتنی ئاستی قسەکردن و دریژە پێدان لە هەمان ئاستدا. ڕەنگە پاش تێ پەڕبوونی چەند خولەکێك دیسان هەست بەگۆڕینی قورسایی لەش بکەن و ئەوجار هەنگاو بەرەو دواوە بەرن، کە چەشنێك هەڵاتنە، ڕەنگە ببێتە هۆی خۆ خەریك کردن بە شتی ترەوە. لە دەمێکی وادا دەبێ پێش بە هەنگاو

هەڵهێنانەوەی وا بگرن. ئەم تێکستەی خوارەوە لە حاڵەتێکدا کە لەش ئازادە و لە حاڵەتی ڕاوەستانی پایەدایە، بخوێنەوە، هەتا تەواو زاڵ دەبن بەسەر ناوەڕۆکەکەیدا. تەنیا ئەو کاتەی کە هەستان بەدڵنیایی کرد. دەتوانن هەستنە سەر پێ، چەند هەنگاو بەرەو پێشەوە بچن و دەست بەخوێندنەوە بکەن.

## خوێندنەوەی تێکست

پرۆڤەی ئێستا ئەوەیە کە ئێوە دەبێ لە حاڵەتی پایەیدا ڕاوەستن و تێکستێك بخوێننەوە. خوێندنەوەی تێکست لە ڕوو دژی تێمی کتێبەکە نییە کە باس لە ڕاهێنان دەکات بۆ ئازاد ئاخافتن و ئازا قسەکردن. گەیشتن بەو ئاستە کە وتاربێژ بتوانێ بەشێوەی ئازاد، ئاخافتن بکات، لە بڕینی پرۆسەیەکدا سەر دەگرێ کە لە تێکست خوێندنەوەوە دەست پێدەکات، جگە لەوە دێتە پێش کە وتاربێژ و قسەکەر لە کاتی ئازاد قسەکردندا ئاماژە بە گوتنێك بکات، کە دەبێت لە ڕووی تێکستەوە بخوێندرێتەوە، یان دێتە پێش کە بەشێك لە ڕاپۆرتێك یان ڕوونکردنەوەیەك یا قسەی تایبەتی کەسێك، لە ڕوو بخوێندرێتەوە.

گەلێك سوودمەند دەبێت ئەگەر ئێوە بۆ بەئەنجامدانی ئەو پرۆڤەیە ئاوالێك پەیدا بکەن یاخۆ کۆمەڵە کەسانێك هاوکاریی ئێوە بکەن، دەبێ ئێوە بتوانن دەورەکان لەگەڵ یەك بگۆڕنەوە. ئەگەر بۆتان نەلوێ دەتوانن، لە دەزگای تۆمارکردنی دەنگ یاخۆ کامێرای ویدئۆ، کەڵك وەرگرن، ئەوەش یارمەتی دەدات بۆ دوورکەوتنەوە لە ترس و باوەڕبەخۆ پەیداکردن و کۆنترۆڵ کردنی خۆ بۆ باشکردن و دروست ئەنجامدانی پرۆڤەکان.

بۆ ئەنجامدانی یەکەمین پرۆڤە، تێکستێکی کورت بێدەنگ بۆخۆت بخوێنەوە، هەتا زۆرباش لەگەڵی ڕادێی، لە کاتی خوێندنەوەدا ژێر ئەو جێگایانە کە پێت وایە لە تێکستەکەدا گرینگن و دەبێ بەرجەستە کرێنەوە خەت بکێشە.

## دەرکەوتنی قسەکەر

پاش ئەوەی تێکستەکەت بەباشی خوێندەوە و ژێر شوێنە گرینگەکانت خەت کێشا، پرۆڤە بۆ ئەوە بکە کە باوەڕبەخۆت پەیدا بکەی و دوایە ئەرخایەن بەرەو پێشەوە بچۆ و دەست بەقسەکردن بکە. ژوورەکەتان وا ئامادەبکەن کە بتوانن ئازادانە ڕاوەستن و پاڵ بەشوێنێك یان کورسییەکەوە مەدەن، ئەم حاڵەتە واتە ئازاد ڕاوەستان دەبێ بەشێوەیەکی ئاگایانە بێت و کەس دەبێ زاڵ بێت بەسەر لەشی خۆیدا. باش وایە لە شوێنی جیاوازدا سەرنج بدەنە شێوەی ڕاوەستان و قسەکردنی خۆتان و کەس یا کەسانی دی کە لەگەڵ ئێوە قسە دەکەن، بەم شێوە دەتوانن خۆتان کۆنترۆڵ بکەن. ئەو شوێنە کە ئێوە بەتەنیا یان لەگەڵ هاوکار و هاوڕێکانتان لێی دادەنیشن، دەبێت ئەوەندە دووربێت کە ئێوە بەئاسانی دەستتان بگاتە نووسراوەکەتان. بەم پێیە دەتوانن قورس و قایم و ئەرخەیان دەرکەوتنی خۆتان تاقی کەنەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەین کە دەبێ خۆتان لێیان بە دوور ڕابگرن، چونکە دەرکەوتنی ئێوە وەك قسەکەرێك، بۆ ڕای گشتی دەتوانێ پڕ مانا و گرینگ بێت. بۆ ئەرخایەن بوون و بەرزکردنەوەی ورە و کۆنترۆڵی جموجۆڵی دەروونی خۆتان بەر لە دەرکەوتن و بەر لە قسەکردنتان بۆیان، لە خۆتان دوور کەنەوە، ئەوەش کاتێك دەکرێ کە ئێوە هەست بەئازادی و سەربەستی تەواو بکەن و ئازاد بتوانن لە کاتی قسەکردندا هەناسە هەڵکێشن و درێژە بەقسەکانتان بدەن، دەبێ پرۆڤەی ئەوە بکەن کە تووشی هەناسە سواری نەبن.

هەر لەبەر ئەوە، ئاگایانە و بەگوڕ هەناسە هەڵکێشان، بەر لە دەرکەوتن و دەست پێ کردن بەقسە، گرینگیی تەواوی هەیە.

خاڵێکی دی کە کارتێکردنی لەسەر چۆنیەتیی دەرکەوتنی قسەکەر هەیە، زاڵبوونە بەسەر نووسراوەکە و ئەو بابەتەی کە پێشکەش دەکرێ،

ئەگەر ئێوە بزانن زاڵن بەسەر بابەتەکەدا، دەتوانن بەکەیفخۆشییەوە بچنە ناو باسەکەوە. ئەم کەیف خۆشیە گەرەکە مرۆڤ لە ئێوەدا بەدی بکات، ئەوە یارمەتیی سەرکەوتنی قسەکان و قسەکردنەکە دەدات. لەم کات و دەمـەدا لـێ گەڕێن ئـەم کـەیفـخۆشییـە دەروونـییـە [نـاوەکـیـیـە] ئـاگـایـانـە بکەوێتە سەر میمیکی دەموچاوتان، بۆ ئەوە مرۆڤ ئەم جیاوازیە بەدی بکات. کەیف خۆشییەك کە لە ناخی دەروونتانەوە دێت.

## ئەرکی قسەکەر [وێژەر] و گوێگر

ئێستا ئێوە دەست دەکەن بەقسەکردن، بۆ ئەوەش نووسراوەکەتان دەگرن بـەدەستـەوە. هـەوڵ بـدەن لـە کـاتـی خـوێندنـەوە بـەدەنگـی بـەرز، کـۆمـەڵـە وشەکـان سەیـرکـەن و تـێکـیـان بـخـەنـەوە پـاشان بـەتـەمـاشاکـردنـی بەرامبەرەکەتان لەبەر بیڵێنەوە. تەماشاکردن یان گۆشەنیگا بەو مانایە، کە بەڕاستی سەیری چاوی کەسی بەرامبەرەکەتان بکەن، نەك بەو مانایە سەیری شوێنێکی تر لە ژوورەکە یان ئەم لا و لا بکەن و گۆشەنیگاتان لە کەسی بەرامبەرتان بدزرێتەوە. گوێگر دەبێ هەست بەوە بکات کە ئێوە بەتایبەتی بۆ ئەو بەشێوەیەکی تەواو شەخسی [خۆمانە] قسە دەکەن.

بۆ ئەوەی بەخێرایی لە نووسراوەکەدا شوێنی قسەکانتان لە کاتی لەبەر قسەکردندا ببینەوە و لێتان ون نەبێ، باشتر وایە لە ئەنگوستی گەورە [قامکە گەورەی] دەستی چەپتان کەڵك وەرگرن و لەگەڵ قسەکردن ئەو قامکە بخزێتە سەردێری دیاریکراو. ئەگەر نووسراوەکەی ئێوە بەشێوەی کتێب بێت ئەم ئەرکە بۆ لاپەڕەی ڕاستی کتێبەکە دەکەوێتە سەر ئەنگوستی گەورەی دەستە ڕاست.

بە کەسی بەرامبەرتان بسپێرن کە لە کاتی قسەکردنی ئێوەدا یاداشت هەڵگرێ و پاشان بیروڕای خۆی بەئێوە ڕابگەیێنێت، ڕادەربڕین دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لە خۆ بگرێ:

* لایەنی باش دەبێت دایم لە پێشدا باس بکرێ و ئەو بەشانەش کە دەبێت باشتر بکرێت، پاشان بگوترێ.
* چ شتێکی قسەکەر [وێژەر] لە دەستپێکدا کاتی دەرکەوتن و هاتنە پێش باش بوو؟
* لە کام شوێن چاولێکردن و گۆشەنیگای قسەکەر [وێژەر] لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گوێگردا باش بوو، کە پێتان وایە دەبێت ئەو بەردەوام بێت لە ئەنجامدانی؟
* ئایا قسەکەر تووشی ئەو حاڵەتە هات کە مرۆڤ هەست بکات کە ئەو کەوتووەتە پۆزیسیۆنی هەڵاتن و خۆدەربازکردن؟ ئایا بۆ گوێگر ئەوە بەرچاوبوو کە قسەکەر پاشان لە پۆزیسیۆنی بنەڕەتی لای داوە و دوورکەوتووەتەوە؟

ئەگەر ئێوە توانیبێتان، بەباوەڕبەخۆ چووبێتنە پێش و نووسراوەکەتان بەلەرچاوگرتنی ڕووبەڕوو بوونەوەی چاو [کۆنتاکتی چاو] گەیاندبێتە گوێگر، ئەوە دەتوانن شانازی بەخۆتان بکەن کە یەکەم هەنگاوتان سەرکەوتووانە هەڵهێناوەتەوە. بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەتان ئەو کەسەی کە هاوکارتان بوو، بتوانێ هەمان سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، دەبێت هەمان کاری ئێوە دووبارە کاتەوە، بەم چەشنە لێرە دەورەکان لەگەڵ یەك دەگۆڕدرێتەوە.

ئێوە دەبنە گوێگر کاتێك هاوکار و هاوڕێ و بەرامبەرەکەتان قسەکانی دەست پێ دەکات.

## بەڕێوەبردنی گفتوگۆ

مەبەست و ئامانجی ئەو کۆرسە ئەوە نییە کە کەسێکی کەم قسە، مرۆڤێکی زۆربلێی لێ دەربێ. ئەم دەورە و کۆرسانە چ بۆ قسەکردن، چ بۆ سیمینار

و یـان وەڵامـدانـەوە یـا نـەدانـەوەی پـرسیـار بـێت و لـەهـەر حـاڵـدا و لـە هـەردەمێکدا مـەبـەست ناوەرۆکی قسە و بـاسەکانە کە دەبێ، بێتە بـەرچاو و دیـدی گـوێگـر. بـێگـومـان ئـێوە بـۆخـۆشتـان وەك گـوێگـرێك ڕازی نـابـن بـەبـیستـنـی قسەی بـۆش و بـێ نـاوەرۆك. لـە كـۆرسەکـانـی پێشوودا کـە، بـەردەوام لـە بـەشداران پرسیارکراوە، کە کام سەرکەوتن و پێشکەوتنێکی شەخسی بۆ ئەوان مـەبـەست و ئـامـانـجە. لە وەڵامدا بـەدەگمـەن واهـەڵکەوتووە کە ئەم وەڵامـەی خوارەوە نەدرابێتە:

دۆست و خزمەکانم ڕەخنەم لێ دەگرن، کە من تەواوی ڕۆژ عارەقە دەڕێژم و زۆر بلێی دەکەم. دەمەوێ فێربم، کەمتر قسە بکەم، بەڵام وا قسە بکەم، کە دەوروبـەرم بـاشتر من قـەبووڵ بکەن.

## قسەکردن و گوێگرتن

زۆربـەی ئـەو کـەسانـەی کـە زۆر بـڵـێن، گـوێ نـادەنـە قسەکـانـی دی. ئـامـادەبـوون و ئـاکتـیڤ گـوێگـرتـن، یـەکێك لـە گـرینـگتـرین مـەرجـەکـانـی هونـەری قسەکردنە. سەرنجی ئەو پڕۆڤـەیەی خوارەوە بدەن. وردبـبنـەوە [هـەڵوەستەکردن – کۆنسێنتراسیۆن] لەو وشانەی کە بەرامبـەرەکەتان لەو تێکستەی خوارەوەدا بەکاری دەهێنێ.

ئـەگـەر دەتـانـەوێ ئـەم پڕۆڤـەیـە بۆخۆتـان بـەتـەنیا ئـەنجام بـدەن، دەتوانن یـەکسەر بچـنە سەر بـەشی مـەشق کردنی وردبوونـەوە" [کۆنسێنتراسیۆن] لە لاپـەڕەکـانی دوایـە. بـەدەنگی بـەرز یـەکجـار ئـەو تێکستـەی خـوارەوە بـخوێنـەوە و پـاشـان هـەوڵ بدە لـەبـەری بنووسییـەوە. لـەم ڕێگـایـەوە دەتوانن لێهـاتوویی خۆتـان بۆ لـەبـەرکردنی بـابـەتەکان پتر بکەن، ئـەوە پڕۆڤـەیـەکە بۆ ڕاهێنـانی زەین.

ئێوە داستـانێك، چیرۆکێکی کورت بۆ کەسەکەی بـەرامبـەرتـان دەگێڕنەوە، چـیـرۆکـێك کـە یـا لـە خـۆتـانـەوە سازتـان کـردووە یـان ڕۆژێك لـە ڕۆژان

بـیستـووتـانـه، بـەرامبـەرەکـەتـان نـابێت قسەکـانـی ئـێوە ببـڕێت، بـەڵام لـە کۆتاییدا دەبێت ناوەرۆکی چیرۆکەکە بۆ ئێوە بگێڕێتەوە و چیرۆکەکە بە وشە و ڕستەکانی خۆی هەڵسەنگێنێت. بەرامبەرکەتان وەك بیسەر زۆر ئـاگـایـانـە دەبـێ پـڕۆڤـەی ئـەوە بـکـات، کـە لـە کـاتـی بـیستـنـی چـیـرۆکـەکـە خـۆبـپـارێزێ لـە دەربـڕیـنـی بـیـروڕا و هـەسـتـی خـۆی، ئـەو نـابـێ بـەهـیـچ شێوەیـەك لـە شێوەکـان پـێش بـەبـیـرکـردنـەوە و گـێڕانـەوەی قسەکـەر و چیرۆکبێژەکە بگرێت و یان هانی بدات. بێگومان ئێوە لە تاقیکردنەوەی خۆتانرا دەزانن: ئێوە دەتانەوێ شتێك بگێڕنەوە، بەڵام بیسەر هەڵدەداتێ و قسەکەتان پێ دەبڕێ و دەڵێ: «ئا بەڵێ بەڵێ هەر لەو پەیوەندیەدا شتێکم وەبیر هاتەوە»

کاتێك بەرامبەرەکەتان کۆتاییی بەگێڕانەوەی چیرۆکەکە هێنا، دەورەکە دەگۆڕنەوە و ئەم جار تۆ گوێ بۆ قسەکانی بەرامبەرەکەت شل دەکەی.

ئەرکی قسەکەر و چیرۆك بێژەکان

* لە بەرچاوگرتن و بەجێ گەیاندنی نیگای چاو [نیگای چاو لەگەڵ چاوتێبڕین تەوفیری هەیە، نیگای چاو نابێت لە ڕادەبەدەر درێژ بکرێتەوە] بەشێوەیەکی ئاگایانە و ئەکتیڤ
* لە بەرچاوگرتن و ڕاگرتنی کاتی دیاریکراو بۆ قسەکردن یان گێڕانەوەکە.
* چێکردن و سازکردنی ڕستەی ڕوون لە چوارچێوەی بنیاتی زمانەکەدا، کە بیسەر لە ناوەرۆکی باسەکە یان چیرۆکەکە نزیك کاتەوە و تێگەیشتن ئاسان دەکاتەوە.

## ئەرکی گوێگر

* ڕامان و وردبوونەوە لەو قسانەی کە وێژەر، قسەکەر دەیانکا.
* قسەکردن بۆ قسەکەر بەجێهێشتن

* بەتەواوی گوێڕاگرتن و بەشداری کردن، قسە پێ بڕین تەنیا لە کاتی زۆر زۆر پـێویستـدا، ئـەویش لـە کـاتـی پـرسیـار و وەڵامـەکـانـدا بـۆ ڕوون کردنەوەی پرسیار یان وەڵام.
* دووری کـردن لـە دەربـڕیـنـی بـیـروبـۆچـوونـی خـۆ، یـان گـێڕانـەوەی تاقیکردنەوەی شەخسی لە کاتی قسەکردنی وتاربێژدا.

## پرۆڤەی کۆنسێنتراسیۆن [وردبوونەوە]

لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بەبیسەری ئەکتیڤ [چالاك] دەری دەخات، کە چـەنـدە چـەتـوون و گـرانـە، خـۆت تـەرخـان بـکـەی بـۆ وردبـوونـەوە و خـوردبـوونـەوەی قسەکـانـی کـەسێك، هـەتـا لـە نـاوەرۆکـی قسەکـان و وردەبابەتەکانی تێ بگەی و لای خۆت بیهێڵیەوە. لە ڕێگای ئەو تێکستەی خوارەوە جارێکی دی [کۆنسێنتراسیۆنی] خۆتان تاقی بکەنەوە، لێ گەڕێن ئەو تێکستە شیعریەی خوارەوە لە لایەن بەرامبەرەکەتانەوە زۆر بەشێنەیی بخوێندرێتەوە. ئێوە دەبێت پاش ئەوەی بەرامبەرەکەتان لە خوێندنەوەی شیعرەکە بووە، شیعرەکە بخوێننەوە، پاش تەواوبوون، کتێبەکە بدەن بەکەسی بەرامبەرتان [هاوکارەکەتان] هەتا ئەویش بیخوێنێتەوە.

من چووم بۆ ناو لێڕەوار.
لەوێندەرێ لە بەرامبەرمدا چاوم بەدارێك کەوت.
لەسەر یەکێك لە لقەکانی چۆلەکەیەك هەڵنیشتبووە.
لقەدارەکە بۆ لای من دەجولایەوە.
ئەو گەڵای شین و سەوز و زەردی هەبوو.
دارەکە دەنووشتایەوە.

ئەم شیعرە لە هی یەکێك لە شاگردەکانی دەورەکانی پێشووە. هەرچەند ئەم کورتە شیعرە، بۆ قسەکەر و وێژەر ئاسان دێتە بەرچاو و ساکار دەنوێنێ، بەڵام دووبارەکردنەوەی لە لایەن بیسەرەوە وا سووك و ئاسان

نییە، لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی شیعرەکە دەبێت لە پێشدا تەواو بگاتە بیسەر.

لە دەورەکەدا، بۆ بەشدارانی کورسەکە ئاشکرا بوو کە لێرەدا باس لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و سروشتە:

مرۆڤ و هەڵسوکەوتی لەگەڵ سروشتدا و بەپێچەوانە هەڵسوکەوتی سروشت لەگەڵ مرۆڤدا.

بەو پرۆڤانە کە ئەنجام دران بیگومان بۆتان دەردەکەوێ، کە چەندە بیسەربوون دەتوانێ گران بێت و چەند پێویست بەکۆنسێنتراسیۆن دەکات. بیسەر دەبێ هەر لە دەسپێکەوە تا کۆتایی، لەگەڵ قسەکان و وتنەکانی قسەکەر و وێژەر بمێنێتەوە.

کۆنسێنتراسیۆن بۆ هەردووك لا، واتە قسەکەر و وێژەر، یەکجار گرینگ و سەرەکییە و بەم چەند تەمرینە کۆتاییی، پێ نایەت، بەڵکو دەبێ بەردەوام لە ژیانی ڕۆژانەدا دووبارە بکرێتەوە. هەڵبەت بیسەری باش و ڕاستەقینە دەتوانێ زۆر یارمەتیی ئێوە بدات، بۆ ئەوەی ببن بەقسەکەر و وێژەرێکی باش.

وانەی ٢

# دەستپێکی وتارێك، بابەتێك

## وتن دەگەڵ بیسەر

*کاتێك تۆ بەرهەمەکەت بەسەرەتایەکی باشەوە دەست پێ کردبێ،*

*کۆتاییی کارەکەت سەرکەوتووانە دەبێت.*

[سۆفۆکل]

ئەم قسە نەستەقە گەرەکە بۆ تۆ هاندەربێت، کە سەرەتای قسەکانت، نووسراوەکەت، بابەتەکەت زۆر بەنیگەرانییەوە دەست پێ بکەی ، لەبەر ئەوە بیسەر هەر لە سەرەتاوە، لە دەستپێکەوە دەخوازێ، دەیەوێت هەست بەوە بکات کە تۆ بەشێوەیەکی زۆر شەخسی دەتەوێ لەگەڵی قسە بکەی. لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەك نابێ هەوڵی ئەوە بدەن، بەرستەیەك دەست پێ بکەی کە تێیدا ئاوا هاتبێت: من ئەمڕۆ دەمەوێ بۆ ئێوە.

نەبوونی وەها ڕستەیەك، باشترە لە بوونی، قسەکان نابێ بەوشەی [شابلۆنی] دەست پێ بکەن، کە پێتان وابێ ئەوە یارمەتیی ئێوە و بیرکردنەوەکەتان دەدات، بەوەش هەر لە سەرەتاوە بیسەر دووچاری زەحمەت دەکەن. ئەم ڕستە دەستپێکە شابلۆنانە لای هەندێك کەس خۆشەویستن و بەردەوام بەکاردەهێندرێنەوە.

لە ڕێگای وشەی "من" کە هەر لە سەرەتاوە بکەوێتە سەر زار چەشنێك دووبەرەکی لە نێوان بیسەر و ئارەزووەکانی قسەکەردا دێتە پێش. سەرئەنجامی ئەم کارە پێکهاتنی حاڵەتی بێ مەیل بوون و گوێنەگرتنە جا چ ئاگایانە بێ چ نائاگایانە.

## دەستپێك، دیاریكەرە

گوتار و قسەكردنی سەركەوتووانە، پەیوەستە بەدەست پێ كردنی بابەتەكەوە، لە پرۆڤە خوارەوەدا فێردەبن، چۆن سەرنجی بیسەر و گوێگر بۆ لای خۆتان رابكێشن. ئیمكاناتی هەڵە و چەوت دەریدەخەن، كە ئێوە لە درێژەی بابەتەكەدا چتان پێ ناكرێ. بەپێچەوانە ئیمكاناتی راست و لە جێدا، ئێوە دەهێنێتە سەر رێگای دروست، و گوێگر دەكاتە هاورێتان. لێرە مەبەست هەڵبژاردنی تێم و ناوەرۆكی بابەتەكە نییە، بەڵكو مەبەست تەنیا دەستپێكی قسەكان و بابەتەكەیە، كە ئەوەش یارمەتی دەكات بەرِوونی و دەركەوتنی تێم و ناوەرۆك.

## وێنە هەڵگرتن وەك رابواردن

### راست

كاتێك ئێوە ئەلبۆمی وێنەی دۆستەكەتان چاو لێ دەكەن، دەڵێن «چ وێنەگەلێكی جوانن! تۆ بڵێی وێنەكانی منیش وا جوان دەربێن! » بیسەر و گوێگر دەتوانێ ناوەرۆكی قسەكان وەرگرێ، لەبەرئەوەی ئەو راستەوخۆ لە لایەن قسەكەرەوە دەكێشرێتە ناو باسەكەوە.

### هەڵە

من دەمەوێ ئەمرۆ بەتۆی نیشان بدەم كە چۆن دەكرێ وێنەی جوان بگیرێ. قسەكەر بەبەرزكردنەوەی وشەی ″من″ و خۆی لە سەرووی بیسەرەوە حیساب كردن، بەم كورتە قسەیە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ گوێگردا دەپچرێنێ.

وای دادەنێین، كە ئێوە دەتانەوێ باسی ناوماڵ بۆ مشتەری بكەن، بۆ

ئەوە کڕیار هان بدەن بۆ بەستنی بیمە کردنی کەلەوپەلی ناومالەکەی:

**ڕاست**

ئەری ئێوە ئاگادار هەن کە شتومەکی ناو مالەکەتان چەندە بایەخدارە؟

قسەکەر بەهێنانە گۆڕی پرسیارێك دەست پێ دەکات، کە نە خودی خۆی، بەلکو مشتەری دەگرێتەوە.

بەمجۆرە ئەو بیسەر بۆ لای بیرکردنەوە هان دەدا.

**هەڵە**

من دەمەوێت ئەمڕۆ زانیاری بدەم بەئێوە کە چۆن بتوانن شتومەکی ناو مالەکەتان بەپارەیەکی زۆر کەم بیمە بکەن. قسەکەر بەهێنانە پێشەوەی فۆڕمی من خۆی دەخاتە پێش. بەوجۆرە بیسەر لە ڕادەی دووەمدا جێ دەگرێ و تەنیا لە پەراوێزدا حیسابی بۆ دەکرێ. ئەم شێوەیە باش نییە بۆ ڕێکلامێکی سەرکەوتوو.

## مۆتۆرسیکلێت، ئەسپی چالاکی من

لە پۆلی فێرگەیەکدا دەبوو خوێندکارێك باسێکی کورت لەسەر ئەسپەکەی [مۆتۆرسیکلێت]ەکەی پێشکەش بکات:

**ڕاست**

ئەوەی کە بۆ کەسێك ئەسپە، بۆ ئەوی تر ماتۆرە..

ئەم دەستپێکە لە پەندی پێشینانەوە وەرگیراوە و پڕە لە زەوق. بیسەر هەر بەبیستنی یەکەم ڕستە دەکەوێتە بیرکردنەوە و دەوری خاو و نەزۆك ناگێڕێ.

**هەڵە**

من دەمەوێت ئەمڕۆ باسی ئەوەتان بۆ بکەم، کە من بە تامەزرۆییەوە مۆتۆر لێ دەخورم، خوێندکاری مۆتۆڕسوار بەم شێوە دەست پێ کردنە، ڕووی دەمی لە هاوپۆڵەکانی ناکات و مەیلی ئەوان بۆ بیستنی قسەکانی ناورووژێنێ.

## کارکردن بۆ دەستپێکی قسەکان

کام دارشتن بۆ دەستپێکی قسەکان لاتان پڕبەجێ بوو؟ کامیان کەمتر بەجێ بوو؟ بیروبۆچوونی خۆتان بەچەند وشەیەك دەرببڕن.

**پێشنیاری بابەت**

ئاژەڵی ماڵی و کەیف خۆشی

کاری باخەوانی

برژاندنی کەباب لە دەرەوەی ماڵ

ئامادەکاری بۆ جێژن

کاتی ڕابواردنی من

ئێستا هەوڵ بدەن، دوو لەو بابەتانەی سەرەوە هەڵبژێرن و دەستپێکی بۆ بنووسن. بۆ ئەوەش، دوو ئیمکان هەیە:

* بەکارهێنانی پرسیاری ڕاستەوخۆ
* نموونە هێنانەوە لە شێوەی کورتە چیرۆکێکدا، کە بیسەر لەگەڵ خۆیدا ڕاکێشێ.

بەراوردی نووسینەکەی خۆت بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە لەگەڵ ئەو نموونانە بکە، کە لێرەدا کەوتنە بەرچاوت. ڕەنگە باشتربێت کە ئەم کارە بەهاوکاریی هاوکارەکەتان ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی بۆتان دەرکەوێ کە

ئایا نووسینەکەی ئێوە لە نموونە ڕاستەکان نزیکە یان هەڵەکان. ئەگەر لە فۆڕمی من کەڵك وەرنەگرن، ئەوە زۆر باش دەتوانن پرسەکە وەڵام دەنەوە.

## بەکارهێنانی لایەنەکانی زمان

پاش پڕۆڤە کردن بۆ نووسینی دەستپێك، لەسەر بنەمای ڕاکێشانی سەرنجی بیسەر، ئێستا زانیارییەکانی خۆتان بۆ نووسینی [وتار] بابەتەکە بەکاربهێنن. بۆ ئەو مەبەستە لە پرۆڤە خوارەوەدا چەند وشەی سەرەکی لە گرووپێکدا هاتووە، کە ئێوە بۆ سازکردنی ڕستە کەڵکیان لێ وەربگرن. بۆ نووسین و داڕشتنی ئەم بابەتە کات و ماوەیەکی کورتتان بۆ دیاری کراوە، لەم ماوەدا دەبێت کارەکە کۆتایی پێ هاتبێت.

**بۆ ئەو کەسانە کە تازەکارن**

ماشێن – چەتر – پاکەتی نامە
سەفەر – کتێب – باران
بەهار – پشکووتن – جیابوونەوە

**بۆ ئەو کەسانە تازەکار نین**

دەزگای نووسین [تایپ] – هەواڵنێر – کارگە
ژیان – ئەوین – لەش ساغی
کاتی ئازاد – لاو – کار
سیاسەت – ڕاستبێژی – بەرپرسیاری

لە ناو ئەو گرووپە وشانەدا تەنیا یەك دەستە وشە هەڵبژێرن و بیر لە نووسینی بابەتێك بکەنەوە کە زیاتر لە لاپەڕەیەکی $A^5$ نەگرێت.

لە لاپەڕەیەکی تردا ئەو سێ وشە سەرەکییە لە ژێر یەکتردا وا بنووسن کە بەجوانی لە بەرچاو بێت.

بۆ دەست پێ کردنی قسەکانتان هەردووك لاپەڕەکە بکشێنە بەردەمی

خۆتـان بـەجۆرێك خێرا بتوانن بـەدەستـەوەی بگرن. بـەم چـەشنە پێش بـەوە دەگرن بۆ پەیداکردنی لاپەڕەکان خۆتان بسووڕێنن و بەم لاوبەولادا خوار بنەوە و بێ سەرئەنجام وێنەی خۆتان لە حاند بینەردا تێك بدەن.

ئەم سێ وشەیە بەئانقەست و بەدڵخواز لە پەنا یەك چندراون بۆ ئەوە پرۆڤەیەکی پڕ لە فانتێزی و خەیاڵ بۆ ئێوە بێت.

## پرۆڤە بۆ پێشکەش کردنی بابەتەکە

پاش ئامادەکردنی بابەتەکە، ئێستا دەتوانی بابەتەکە پێشکەش بەکەسی هاوکار یان ئەو کۆمەڵە خەڵکە بکەی کە ئامادەن. بەکەڵك وەرگرتن لەو سێ وشەیە دەبێ چیرۆکێکت ئامادە کردبێ، بەڵام بەرلەوە دەبێ ئەو دەستپێکە کە پێشتر داترشتبوو پێشکەشی بکەی. هەرچەند ڕستەکەی دەستپێك بەنووسراوە لە بەر دەستتان دایە، نابێ خۆتان تووشی هەڵە بکەن و لە ڕوو بیخوێننەوە. هەردەم سەرەتا دەبێت بەو ڕستانەی دەستپێك دەست پێبکرێ کە لە ناو مێشکتاندا ئامادەتان کردوون، نابێ لە ڕووی کاغەزەکەوە بیخوێننەوە. دەبێ سەرنج بدەن کە ئەو بەشە، واتە قسەکانی دەستپێك، بەتەواوی باس بکەن و نەکا بکەونە پەلەپەل و هەر سێ وشەکە لە ڕستەیەکدا جێگا بکەنەوە و یەکسەر و بەپەلە بیهێننە سەر زمان. بۆ کۆنترۆڵ کردن بڕوانە ئەم وێنەیەی خوارەوە.

**داڕشتنی نموونە**

**ئەورووپا – چاویلکە – دۆزەخ**

چ کەسێك خەون بەسەفەرێکی خۆش و پڕ لە ڕووداوی دڵخۆشکەرەوە نابینێ؟ مەگەر بلیتی خۆشبەختیت بۆ دەرکەوێ، دەنا سەفەرێکی وا پێویستی بەپارە هەیە کە دەبێ بۆی پاشەکەوت بکەی. بەڵام سەرئەنجام کاتی هات.

گەرەکمە بۆتان وەگێڕم کە چۆن سەفەری من بۆ ئەورووپا ڕێککەوت. ئێمە سەردانی پایتەختەکانی ئەورووپامان کرد. بەهەموو جوانییەکانەوە کە وەبەرچاومان دەکەوت. بەڵام هەر لە سەرەتاوە یەکەم گیروگرفتەکان سەریان هەڵدا. من وەك خەرەفاوێك لە بیرم چوو پێش لە سەفەر بچم بۆ لای دوکتوری چاو. بەو چاویلکە کۆنەوە نەمدەتوانی بەگوێرەی پێویست ببینم، لای خۆم پێم وابوو چاویلکەم ناوێ، هەر ئەوە بۆخۆی کەوتنە دۆزەخەوە بوو. بەڵام مرۆڤ فێردەبێ چۆن ئاستەنگەکانی خۆی چارەسەربکات. لە یەکەمین وێستگەی سەفەرەکەمان لە پاریس بەشوێن دوکتورێکی چاودا گەڕام. بەهەڵتەکاندنی گیرفانەکانم چاویلکەیەکم لە چاو کرد و خۆم تەیارکرد بۆ دیتنی هەموو ئەو جوانییانەی کە لەو سەفەرەدا لەسەر ڕێماندا بوون.

## کایە بە وشە لە ڕێگای کارتەوە

ئێستا کایە – پرۆڤە چاوەڕێی ئێوەیە. ئەگەر بەکەیفێتانە خۆ بە مقەست و کاغەز و قەڵەمی ڕەنگییەوە خەریك بکەن، ئەوە ١٢ دانە کارتی بچکۆلانە بەگەورەیی [٣ – ٤ سانتی مەتر] چوارگۆشە ببڕن و لەسەر هەر کام ناوی شتێك بنووسن یان بکێشنەوە. کارتەکان هەڵگەڕێننەوە و لە شوێنێك دایان بنێن و سێ دانە لەو کارتانە دەرکێشن. بەم سێ وشەیە نووسینێك ئامادە بکە. بۆ نووسینی ئەم بابەتە لێرەش پێویستە دەستپێکی جوان ئامادە بکەی و بینووسی. پاشان هەر وەك پرۆڤەکانی پێشوو، دوو لاپەڕەتان لەبەر دەست بێ، یەك نووسراوەی دەستپێك و دوو وشەکان، ئەوجا لە بەرانبەر کەسانێك یان هاوکارەکانتان قسەکانت دەست پێ بکە. دوای تەوابوونی قسەکان و بیستنی بیروڕای هاوکارەکانتان دەورەکە دەگۆڕنەوە، ئێوە بیسەر دەبن و هاوکارەکانتان وێژەر یان قسەکەر.

## هاندانی بیسەر

هەرچەند تۆ هێشتا لە سەرەتای دەورەکە دای، بەڵام دیسان زانیاریت لەسەر چۆنیەتیی قسەکردن و دەرکەوتن بۆ سەر سەکۆ پەیداکردووە. پێویستە بەردەوام سەرنج بدەیە قسەکردنی ئەو کەسانە کە لە تەلەفزیۆن دەردەکەون یان لە کۆبوونەوەکان قسە دەکەن. سەرنج بدە بزانە ئەوانە چۆن قسەدەکەن و چی دەکەن. لەم ڕێگایەوە دەتوانی زۆر یارمەتیی خۆت بدەی. دەتوانی لایەنە باشەکان وەرگری و لایەنە خراپەکان بناسی.

هێندێك قسەکەر و وێژەری باش هەیە کە مرۆڤ دوچاری سەرسامی دەکەن، کاتێك کە دەبینی کە چۆن هەر لە دەستپێکەوە هەتا دوا ڕستە، بیسەر گوێ و تولاخ دەهێڵنەوە و ئاستی قسەکردن و گەرمیی قسەکانیان داناکەوێت. قسەکردنێکی ئاوا کە باوەڕی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ جێگای سەرنج و جێگای لێ فێربوونە، قسەکردنێکی وا لە باوەڕی قسەکەر و کەسایەتیی قسەکەرەوە سەرچاوە دەگرێ و بێگومان لەسەر دڵی بیسەریش دەنیشێ. بۆ کەسێکی وا وتاردان و قسەکردن لەسەر بابەتێکی پسپۆڕی و وانەییش نابێتە جێگای گرفت، بەڵکو هەر بەو لێزانین و تێگەیشتنەوە دەتوانێ سەرکەوتووبێت. ئەمەش بۆ خۆی ئەوە دەگەیەنێ کە ئێوەش دەتوانن لە ڕێگای زانین و فێربوون و بەردەوام بوونەوە سەرکەوتووبن، هەر وەك چۆن نموونەی خوارەوە دەری دەخات.

کۆمەڵە لاوێك دەیانویست بەپێشکەش کردنی گۆرانییەك بەشداری لە ئاهەنگێکدا بکەن، مامۆستاکەیان لە ڕێگای پێش گوتنێکەوە توانی بینەران و بیسەران وا بخاتە چاوەڕوانییەوە کە هەموو بەشدارانی ئاهەنگەکە لە بێدەنگی تەواودا ماتڵی بیستنی گۆرانییەکە مانەوە. ئەم مامۆستایە چۆن توانی کارێکی وا بکات؟

سەرنج بدەن، کە چۆن قسەکەر، بیسەر وە جۆش دەخات، چۆن ئەو

ئاگایانه خۆ دەپارێزێ لە گوتنی زیادی و چۆن تەکنیکی چاوپۆشین بەکاردەهێنێ. بەراوردی دەستپێك و کۆتاییی قسەکان بکەن. بزانە لە کام شوێندا قسەکەر لە مەبەستی سەرەکیی خۆی دووردەکەوێتەوە و چارشێو لەسەر قسەکانی هەڵدەداتەوە و بیسەر ئاگاداری زانیارییەکان دەکات کە باس لە کێ و لە چییە؟

## نووسین لەسەر کەسایەتییەك

چیرۆکی ژیانی ئەو کەسە، کە لێرەدا باسی دەکەین، ناتوانرێ بەتەواوی ڕووناکیی بخرێتە سەر.

سەرەتا لە شاری نورنبێرگ هەڵی داوە. لە کاتی دادگاییکردنیدا گێڕاویەتەوە، کە ئەو لەودەمەوە کە توانیویە بیربکاتەوە، بەتاك و تەنیا لە ژوورێکی تاریك و تنۆکدا دانیشتووە. دووجار ژیانی پێ بەخشراوە. جاری یەکەم قەڵەشتە برینێکی لێ پەیدا بووە، کە کەسێکی نەناسراو و سەبەبی بووە.

لە ١٨٣١ کابرایەکی ئینگلسی بەخێوی کردووە، بەناوی "لۆردستان هۆپە"، ئەو پاشان سپاردوویەتە دەستی مامۆستایەکی مەدرەسەی میللی لە شاری ئانسباخ. لە دادگایەکی ئەو ناوچەیەدا بۆتە سکرتێرێکی ساکار و ئاسایی کە کارەکەی کۆپی کردنی پەروەندە بووە، کۆپی نووس بووە، لەم دەورەیەدا پێشکەوتنی زەینیی ئەو وەدواکەوتوو و لە جێداماوەتەوە.

لە ١٨٣٣/١٢/١٤ بۆ جاری دووەم ژیانی کەوتووەتە مەترسییەوە: سێ ڕۆژ دواتر کۆتایی بەژیانی هات. ئەمە بەسەرهاتی کاسپار هاوزێرە! لێرەدا قسەکەر [نووسەر] بەکەڵك وەرگرتن لە نووسینی هەنگاو بەهەنگاو، بیسەر بۆ ئەو لایە هان دەدات کە خۆی هەوڵ بدات وەڵامی پرسیارەکان پەیدا بکات. قسەکەر جۆشی چیرۆکەکە بەشێوەیەکی کەوانی دەکێشێ، کە هەر لە دەستپێکەوە دای مەزراندووە، لە درێژی گێڕانەوەکەدا ئەم کێشە بەردەوامە هەتا لە کۆتاییدا لە پڕێکا ئازادی دەکا.

ئێستا لەسەر کاغەزێك وشەگەلێك لەم چیرۆکە بنووسنەوە و پاشان بەشێوەیەکی ئازاد لە ژوورەکەدا ڕاوەستە و ئاگایانە بەکەڵك وەرگرتن لە تەکنیکی ئەم چیرۆکە، چیرۆکەکە بگێڕەوە.

ناوی پاڵەوانی چیرۆکەکە دەبێ لە کۆتاییدا بدرکێندرێ. ئاگاداربن کاتی دەرکەوتن، دەبێت وا دەرکەون کە لە دەرسەکانی پێشوودا باسمان کردووە. [لێرە شێوەی قسەکردنی ئازاد و ڕەها بەکاردەهێنن و جگە لەو چەند وشە کە نووسیوتانە، چی دی بەکارناهێنن]. هاوکارەکەتان لە کۆتاییدا دەبێ بیروڕای خۆی سەبارەت بە دەرکەوتن و گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە لایەن ئێوەوە باس بکات. لە کاتی ڕەخنەگرتندا نابێت لە بیربچێتەوە لە پێشدا دەبێ لایەنی باش باس بکرێ و پاشان باس لەو لا یەنانە بکرێت کە دەبێ باشتر بکرێن یا وەلابنرێن.

## گۆڕینی دەور [ڕۆڵ]

بۆ ئەوەی فێربن، قسەکردنێکی باش هەڵسەنگێنن و کلیلی سەرەکی لە نووسراوەکەدا دیار بکەن، دەبێ ئێستا دەوری بیسەر، گوێگر بگێڕن و گوێبیستی قسەکانی هاوکارەکەتان بن. هاوکارەکەی ئێوە ژیاننامەی کەسایەتییەك بەدڵخوازی خۆی هەڵدەبژێرێ و بەئێوەی دەناسێنێ. لێرە دەبێ بەشێوەی نووسراو لە تەکنیکی خۆلادان کەڵك وەربگیرێ.

لە کۆتاییدا باس لەو لایەنانە بکەن کە دەبێ باشتر بکرێ.

### ئازاد و ئاواڵە هێشتنەوەی بیرکردنەوە

سەرنج بدە نموونەیەکی دی لەو تێکستانە، بزانە چۆن نووسەر بەئانقەست بیروبۆچوونی ئاواڵە دەهێڵێتەوە.

ئەم شێوەیە چ کارتێکردنێکی لەسەر بیسەر دەبێ؟

## ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ڕاستەقینە

زۆربەی خەڵك بەڕۆژ لە شەقامەکان ماشێن لێ دەخورن. بەڵام من حەز دەکەم بەشەو ماشێن لێ بخورم، تەنانەت ئەگەر ڕێگا دوور و درێژ بێت. لە ڕێگای هامبورگ بۆ فرانکفۆرت [قەراخ چۆمی ماین] لەگەڵ شتێکی سەر سووڕهێنەر ڕووبەڕوو بووم. ٥٠ کیلۆمەترێك پاش شاری گوێتینگن ماشێنێك کەوتە بەرچاوم، کە لە قەراغ جادەکە ڕاگیرابوو، چرای ئاگادارکردنەوەی بەردەوام هەڵدەبوو و دەکوژایەوە. لەبەر ئەوەی من بەئەرکی خۆمی دەزانم لە کاتی وادا یارمەتی بدەم، ماشێنەکەم ڕاگرت. لە ناو ماشێنەکەدا منداڵێکی بچکۆلانەی ڕەنگە تەمەن چوار ساڵان، سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشام کە لە حاڵی هەناسە برکێدا بوو، دایکی بێ دەرەتان و ماندوو دیار بوو. من بەپەلە ئیمرجنسی-م ئاگادار کردەوە، کە پاش تێپەڕبوونی چەند دەقیقە دکتۆر گەیشتە شوێنەکە.

ئەم بەسەرهاتەم تەواو لە بیرچووبووەوە، تا ئەوەی ڕۆژێکیان نامەیەکم لە لایەن دادگاوە بەدەست گەیشت، کە بانگیان کردبووم. لەوێ ئاگادار کرام کە منداڵەکە گیانی لە دەست داوە.

ئایا قسەکەر، ویژەر بەم شێوەیە گێڕانەوەیە زۆرتر بە مەبەستی خۆی دەگات، یان گێڕانەوەیەکی سەرسەری؟ ئایا دەتوانی ڕووداوەکە لە زەینی خۆتدا بهێنییە بەر چاو و بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکە لەم شێوە و ئیستیلە کەڵك وەرگری؟ ئایا بینەر بەم شێوەیە باشتر سەرنج دەداتە گێڕانەوەکە و هەموو بەشەکانی گێڕدراوی ڕوداوەکە؟

ویژەر لە ڕێگای ئاواڵە هێشتنەوەی بیرکردنەوەوە، بیسەر بۆ ناو ڕووداوەکە دەکێشێ و هانی دەدا بیربکاتەوە و لە حاڵەتی خاوی و پاسیڤ بوون دەری دەهێنێ. بیسەر بەم شێوەیە لە گفتوگۆ و دانیشتنی پاش گێڕانەوەکەدا، ڕاستەوخۆ بەشداری دەکات و دەکەوێتە پرسیارکردن.

لـەم نـووسراوەدا ڕووبـەڕوو بـوونـەوەیـەکـی ڕاسـتـەقـیـنـەی یـەکـێك لـە گرفتەکانی نووسین و قسەکردن کە زۆر گرینگە، خۆی دەنوێنێ، واتە کورت کردنەوە! بەتایبەت بۆ ئەو کەسانە کە زۆربڵێن، کارێکی زۆر گرینگ و پێویستە. ئەوەش تەنیا بۆ ئەو کەسانە نییە کە خوێندکاری کورسی قسەکـردن و وتـاربـێژیـن، بـەڵکو بـەپـێچـەوانـە هـەمـوو ئـەو کـەسانـەی کـە بەشداری ئەو کۆرسانەش نین، دەبێ فێربن، لە نووسین و لە قسەکردندا سنوور بۆ خۆیان دابنێن، دەبێ فێربن پێش بەزۆر نووسین و زۆربڵێیی خۆیان بگرن. هەر لەبەر ئەوە ئەم چەشنە نووسین و نموونانە کە دەرفەت دەدات بەبیسەر بۆ بیرکردنەوە و بەشداربوون لە گفتوگۆکاندا زۆر گرینگە.

وانەی ٣

# دارشتنی زمان لە نووسینی بابەتێکدا

هەرچەندە ئێوە تا ئێستا تەنیا دوو وانەی ئەم کتێبە فێر بوونە، بەوحاڵەش توانیتان فێربن، چۆن وتارێك دەست پێ بکەن، چۆن بیخەنە ناو چوارچێوەی فۆڕمەوە، چۆن کێش و هاندانی تێدا پێك بێنن و تا کۆتایی ڕای بگرن. تا ئێستا ئێمە تەنیا باسی ناوەڕۆك و فۆڕمان کردووە. بەڵام لایەنی دەرەوەی دارشتن و بەکارهێنانی زمان گەلێك گرینگە، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بەباشی لە لایەنی [دەنگ و تۆن]ەوە لێتان حاڵی بێت. هەر بۆیە چۆنیەتیی دارشتنی زمان گرینگە.

## بەکارهێنانی زمانێکی زیندوو

ئێوە بەپێی تاقیکردنەوەی خۆتان دەزانن، کە وتارێکی گرینگ دەتوانێ بیسەر ماندوو بکات، ئەگەر لە فۆڕمێکی یەك خەتی و سستدا پێشکەش بکرێ. لە حاڵەتێکی وادا وتاربێژ لە مۆسیقاژەنێك دەچێ کە لە کاتی ژەنیندا لە بیری بچێت لە هەموو ئیمکانەکانی دەنگی مۆسیقایی ئامێرەکەی کەڵك وەرگرێ. لە مۆسیقادا بەهیچ جۆرێك نابێ دینامیك جێگای چۆڵ بێت. لە زماندا قانوونێکی چەشنی قانوونی مۆسیقا بەکاردەهێندرێ. لەو شوێنانە کە کێش بەوپەڕی خۆی دەگات، دەتوانرێ لە ڕێگای گەڕانەوە و نەرم گوتنەوە زۆر باشتر گوێگر بەرەو درێژەپێدان بەگوێگرتن هان بدرێ، هەتا بەرز قسەکردن، ئەوەش لەوەدەچێ کە لە پرێکدا ترومپێت ژەن لە تۆنی سەرێ، ترومپێت بژەنێت. ئەو کەسانەی کە پێیان وایە لە ڕێگای بەرز قسەکردن و گوڕاندنەوە دەتوانن گرینگترین بەشی وتارەکەیان باشتر بگەیەننە بیسەر، قسەی پووچ دەکەن. ئەوەی ئێوە وەك وتاربێژ دەتوانن لە ڕێگای دەنگێکی نەرم و ئارامەوە بیگەیەننە

بیسەر، وەك ئەوە وایە كە ئێوە لەگەڵ بیسەر دوو بەدوو دابنیشن و قسەی لەگەڵ بكەن، وتارێك كە لەو چەشنە زۆر باشتر لە مێشكدا دەنیشێ و دەمێنێتەوە هەتا گوتنێكی بەدەنگی بەرز و قیژە و هەرا بیانەوێ بیگەیەنن. بەڵام لە گوتنێكی ئاوادا دەبێ هێز و توانا بەرچاوبێ و یا ئەوەش لە بیر نەچێ كە كۆنتاكتی چاو لە نێوان ئێوە و بیسەردا دەبێ بەردەوام بێت، بۆ ئەوە بیسەر لە قسەكانی ئێوە باشتر تێ بگات و هەستی نزیك بوون لە رێگای چاو و سەرجەم میمیكی دەموچاوەوە لەودا پێك بێت.

**زمانی پاراو**

بـۆ بـارودۆخـی جـیـاواز: لە كـاتـی قسەكردن بـەتـەلـەفـۆن لـەسەر كـارەوە، قسەكـردن بـۆ تـۆمـاركردن لـەسەر ئـۆتـۆمـاتـیكـی دەنگ، قسەكـردن لـەگـەڵ هـاوشانـێكـی سەركـار یـان دەست بـەرزكـردنـەوە و قسەكـردن لـە كـۆڕ و سیمینارێكدا، پێویستە بەشێوەیەكی پاراو بێتە ئاخافتن. لەم كاتانەدا جا چ نەرم قسە بكرێ یان بەرز، دەبێ سەرنجی جیددی بدرێتە سەر ئەو پیتانە لە وشەكاندا كە دەنگدارن، گەیشتن بەو ئاستە كە وێژەر بەئاسانی بتوانێ ئەم كارە بكات، پێویستی بەڕاهێنان و پرۆڤە كردنی بەردەوام هەیە.

[لێرەدا دەبێ تایبەتمەندیی زمانی كوردی لە بەرچاو بگیرێ– بۆ ئەوە ئـەم تـایـبـەتـمـەندییـانـە لە زمـانـی كوردیدا بـەشێوەی زانستـی لـە كـاتـی قسەكردندا جوانتر دەركەون، بیستنی بەرهەمەكانی شیعر و پەخشانی هەژارانە، هێمنانە، وێنە و سەفەری خەیاڵی، كە لە لایەن "ناوەندی شانۆی كۆچەر– ئەڵمان" ەوە بڵاوكراوەتەوە، سوودمەندە]

ئەگەر دەخوازن لە كاتی قسەكردن و وتارخوێندنەوەدا، خەڵك بەباشی لێتان تێ بگات، دەبێ خۆتان بەفێربوونی دەنگەكانەوە خەریك بكەن. [بۆ هەر زمانێك دەبێ سەرنجی تایبەتمەندییەكانی ئەو زمانە بدرێ. هەر وەك

چۆن زمانەکانی ئەڵمانی، فەرانسایی، ئیتاڵی، ڕووسی و ئینگلیزی لەم بەشانەدا، گەلێك جیاوازن، زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیش زۆر زۆر لەگەڵ یەك جیاوازن. ئەوەی کە جێگای سەرنجی زۆر جیددییە، ئەوەیە کە بەشێکی زۆری خەڵکی کورد بەتایبەتی لە شارەکان دەنگەکانی ناو وشەکانی زمانی کوردییان تێکەڵ ئەو زمانانەی سەرەوە دەکەن، یان لەسەر بنەمای دەنگەکانی ئەو زمانانە بەکوردی قسە دەکەن، ئەو کەسانەی کە زمانی قسەکردنیان بەمجۆرە بێت، بەتایبەت لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دەنگ و ڕەنگ [ڕادیۆ و تەلەفزیۆن] و هەروەها شانۆ و سینەماو گۆرانی گوتن، گەرەکە بەر لەوەی دەست بەوتاربێژی، وێژەری و گۆرانی چرین بکەن، و زمانەکەیان وەك چۆن هەیە فێر ببن، دیتنی دەورەکانی فێربوونی تەکنیك و هونەری وتاربێژی و وێژەری، کارتێك سوودبەخش دەبێ کە مرۆڤ زاڵ بێت بەسەر زمانەکەیدا]. بۆ ئەو مەبەستە هەر ئێستا پرۆڤەی ئەو پیتە بێ دەنگانەی زمانی ئەڵمانی بکەن کە لە خوارەوە لە ناو ئەو تێکستەدا دێت:

[د–، ت–،گ–، ك–، ب–، پ–]. بەرلەوە تێکستەکە بخوێنییەوە، دەبێ کەرەسەکانی ناو لەش کە بۆ دەرهێنانی دەنگ پێویستن ڕەها بکرێن و ئازاد بن [لەوانە ژێر چەنە، ماسوولکەکانی لەش، سینگ، سەر، لەگەن، زگ]. ئەم تێکستە، یان خۆ لەگەڵ هاوڕێیەکەتدا بخوێنەوە، سەرنجی بە پیتەکانی بێ دەنگ و دەنگدار بدە. بەڵام هۆشیاربە نابێ بەشێوەیەکی زۆر جیدی لەگەڵ ئەم تێکستە ڕووبەڕوو بی، ئازاد و لەسەرەخۆ.

[هەرچەند لێرە باس لە تایبەتمەندییەکانی زمانی ئەڵمانی دەکرێت، ئێوە لەم پرۆڤەیەی خوارەوەدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ زمانی ئەڵمانی ڕووبەڕوو نابن، بەڵکو لەگەڵ تێکستی بەکوردی کراوی ئەو زمانە ڕووبەڕوون، مەبەست لێرە پرۆڤە کردنی زمانەکە و دەنگەکان و بەکارهێنانی تەکنیك و پرینسیپەکانی قسەکردنە کە ئێوە لە تێکستە کوردییەکەشدا دەتوانن

بەکاری بهێنن. لەسەر زمانی کوردی کارکردن لەم پەیوەندییەدا، دەبێتە کارێکی تایبەتیتر کە دەبێ بەجیا لە توێی کتێبێکی تردا باسی بکرێ کە ئەویش دەچێتە خانەی ڕاهێنانی دەنگ لەسەر بنەمای زمانی کوردی! لەگەڵ ئەوانەشدا پیتەکانی [د–، ت–، گ–، گ–، ب–، پ–] لە کوردیشدا لە کاتی گوتندا فۆنکسیۆنی نزیك بەزمانە ئەڵمانییەکەیان هەیە]

نموونە

| | |
|---|---|
| لە ناو کلێسا | بیم – بەم – بۆلیشە |
| دەڕوا | بیم – بەم – بۆلیشە |
| قاز سەما دەکا | بیم – بەم – بۆلیشە |
| لەگەڵ مانگا | بیم – بەم – بۆلیشە |
| دایە | بیم – بەم – بۆلیشە |
| لێ دەنێ فڕنی | بیم – بەم – بۆلیشە |
| منداڵ | بیم – بەم – بۆلیشە |
| ئەنگوستی تێ دەنێ | بیم – بەم – بۆلیشە |

[لەبەر ئەوەی مەبەست نیشاندانی دەنگەکان بوو، لێرە تێکستە ئەڵمانییەکە بەکوردی هاتووە، کە دەنگەکان تێیدا پارێزراون و ئاهەنگەکەش ون نەبووە. ئێوە دەتوانن دەیان نموونە لە تێکستی منداڵان و ئاوازی کایە کوردییەکان بەکاربێنن، بۆ وێنە هەکڵ مەکڵ کڵ کاکۆکێ، زەرد و سوور و شەمامۆکێ. مێخم کوتا، مێخ هەڵبەزی، تیکەی چەپم لەوە چەقی].

## [**خاو**] **ئازاد قسەکردن**

ڕەنگە کاتی بیستنی ئەم شیعرە، بیر لە ناقوسی کلیسا بکەنەوە. لە کاتی خوێندنەوەیدا دەبێت کارێکی وا بکەن کە بگەنە دەنگێکی لەو چەشنە.

ئـەوەش لـە ڕێگـای بـەکـارهـێنـانـی سیستـەمـی دەنگ و لـەشەوە دەلـوێ. دەنـگدانـەوەی دەنگ، لـەسەر و سینـگدا ڕەنگدانـەوەی هـەیـە، ڕەنگدانـەوەی دەنگ لـە نـاو لـەشدا پـەیـوەنـدیـی بـەمـاسوولـکـەکـانـەوە هـەیـە، کـاری ماسوولکەکان نابێ بەچەشنێك بێت کە دەنگەکان بلۆکە بکەن و ڕێگایان لـێ بـگـرن. بـۆ ئـەوەی دەنـگـی پـڕ لـە نـاو زاراوە بـێتـەدەر، دەبـێت بـەشی خوارەوەی چەند تەواو ئازاد و خاو بێت. جارێك هەوڵ بدەن لە کاتێکدا کە ددانەکانی سەرێ و خوارێ لەسەریەك داندراون، زۆر بەبەرزی قسە بکەن. دەزانن کە ئەمە ناکرێ. کەوایە دەبێ ددانەکان دوور لە یەك بن. ″مارتین لۆتێر″ لە دڵەوە دەڵێ «تازە بە تازە وەرە، دەم هەڵپچڕە و خێرا دای خە».

دەرهـاوردنی دەنگێکی بەرز پێویستی بەهـاوبەشیی ژوورەکانی دەنگ و کردنەوە و ئازادکردنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی دەنگ هەیە. چەنە و ژێر چەنە، دەبێت بتوانن بجوولێنەوە هەتا بەتەواوی بکرێنەوە. هەر بۆیە بەر لە دەست پێکردن بۆ خوێندنەوەی نووسراوەیەك، دەبێ تاقیی بکەنەوە کە ئایا چەنە و ژێرچەنە ئازاد و شلن و دادەکەونە خوارێ یان نا. هاوکات دەبێ کێشی ناوشان لاچێ و ئازاد و شل بێ و گرژی و چیڕی تێدا نەمێنێ، هەردووك قۆڵ و باسك دەبێ قورس و گران داکەوێنە خوارێ.

ئەمە ڕوون و ئاشکرایە کە چۆن هەر بەرهەمێکی دەنگ لە ناو لەشدا لەگەڵ لاڕێی ڕووبەڕوو دەبێت، ماسوولکەی کێشراو و چیڕ، حاڵەتێکی پڕ لە هەڵە پێکدەهێنێ، کە ئەوەش هۆی هەڵەی ڕۆحی و دەروونیی مرۆڤەکە دەگەیەنێ. لە حاڵەتێکی وادا ناگوترێ کە وێژەر، بێ مانا قسە دەکات، بەڵکو دەگوترێ تێکخستنەوەی قسەکان دوچاری کۆمیلێکس بووە، یانی: دووچاری تێکچڕژان بووە.

لە حاڵەتێکی وادا بێ ئەوەی بزاندرێ لەش و ڕۆح [دەروون] دەکەونە تێکهەڵپڕژانێکی هاوبەشەوە. هەر بۆیە بۆ وتاربێژ و وێژەر گەلێك گرینگە

که هەموو جارێك ئازادکردن و شل کردنی لەش بەئەرکێکی جدی خۆی بزانێ. هەتا ئێوە بیر لەوە نەکەنەوە ئەو حاڵەتە لەخۆڕاوە پەیدا نابێت. لەبەر گرینگیی ئەم بابەتە، لە سەرجەمی کۆرسەکەدا ئێمە گرینگی و بەهایەکی جیددیمان بەئازادکردن و شل کردنەوەی لەش و ماسولکەکانی داوە، ئەوەش بە یەکێك لە بنەماکانی جیدیی دەورەکە دادەنرێ. بۆ شلکردنەوەی ژێرچەنەی خوارەوە ئەم پرۆڤە ئەنجام بدە:

| | |
|---|---|
| لە ناو کلێسا | بەم – بەم – بالیشە |
| دەڕوا | بەم – بەم – بالیشە |
| قاز سەما دەکات | بەم – بەم – بالیشە |
| لەگەڵ مانگا | بەم – بەم – بالیشە |
| دایە | بەم – بەم – بالیشە |
| لێ دەنێ فرنی | بەم – بەم – بالیشە |
| منداڵ | بەم – بەم – بالیشە |
| ئەنگوستی تێ دەنێ | بەم – بەم – بالیشە |

ئەم تێکستە بەتەنیا یان لەگەڵ هاوکارەکەت بەجووتە بخوێنەوە، ڕستەیەك تۆ و ڕستەیەك ئەو. لە کاتی دوبارەکردنەوەی بیم – بەم بالیشە دەنگ نزم کەنەوە و تەواو چەنەتان خاو کەنەوە، شل کەنەوە.

خۆتان لە حاڵەتێکی وادا دابنێن کە بتوانن بەرزترین دەنگ بەرهەم بێنن، بۆ ئەوەش دەبێ تەواو [کۆنسێنتراسیۆن]تان هەبێ. نەکا هەوڵ بدەن بەشێوەیەکی نابەجێ لەگەڵ دەنگی خۆتان مامەڵە بکەن و ئازاری دەنگتان بدەن.

بەداخەوە لێرەدا ئیمکانی ئەوە نییە، بەشێوەیەکی عەمەلی [پراکتیك] کار لەسەر دەنگ و سیستەمی دەنگ بکەین، بۆ ئەوە پێویستە ڕاهێنەری

دەنگ خـۆی ئـامـادە بـێت. [هـەڵسوکـەوت کـردنـی هـەڵـە لـەگـەڵ دەنگ و سیستەمی دەنگ و ئەندامانی پێکهێنەری دەنگ لە لەشدا، دەتوانێ گەلێك زیان بەخش بێت. هەر بۆیە بەهیچ شێوەیەك نابێ بەنەزانی و لە خۆڕاوە مامەڵە لەگەڵ قورگ و ژێکان و گەروو و سینگ و باقیی کەرەسەکانی پێکهێنەری دەنگ بکرێ. من خۆم زۆرجار لە کۆرسەکاندا بەشدارانم بینیوە کە شەڕیان لەگەڵ دەنگی خۆیان کردووە. ئەو کەسانە ئەگەر لەو ڕێگایەوە زیان بەسیستەمی دەنگی خۆیان بگەیەنن نە تەنیا نابن بەوێژەر و وتاربێژ بـەڵـکـو دەنگـی ڕۆژانـەی خـۆشیـان نـەخـۆش دەخـەن. بـەداخـەوە ئـەم شێوە مـامـەڵـە کـردنـە لـە نـاوخـۆی وڵات تـەنـانـەت لـە لایـەن شانـۆکـاران و مامۆستاکانی شانۆوە بیندراوە. کەسانێك پێیان وایە دەبێ وەك وەرزشکار و سەرباز، وەرزش و مەشق بەلەش لەوانە بەسیستەمی دەنگ بکرێ، لەشی هیچ شانۆکار یان وێژەر و وتاربێژێك، پێویستی بەلەشکوژی، دەنگکوژیی لەو چەشنە نییە. ئەوەی پێویستە ناسینی لەش و ئەندامەکان و شێوەی کاری ئەندامەکان و ڕاهێنانیانە لە ناو سیستەمێکدا، بۆ ئەوەی بکرێ ئەو ئەندامانە بۆ هەرکام لەو مەبەستانە واتە وێژەری، وتاربێژی، شانۆگێڕی بـەشێوەیـەکـی تـەندروست بـەکـاربـهێندرێ. هـەر بـۆیـە زۆر بـەجیدی داوا دەکرێ تەنیا لە چوارچێوەی وانەکانی ئەم کتێبەدا پرۆڤەبکرێ. بۆ ئەوە زیـان بـەلـەش بـەتـایـبـەت حـەساسترین بـەشی دەنگ واتـە ژێکـانـی دەنگ نەگەیەندرێ پێویستە ئەوەش بگوترێ کە سیستەمی جیاواز بۆ ڕاهێنانی دەنگ هـەیـە و لـە پشت هـەر کـام لـەو سیستـەمـانـە، بۆچوونی تـایبـەتی زانستی، پزیشکی و بگرە فەلسەفیش هەیە، [من لە داهاتوودا چەند کتێبی تـایـبـەت بـەڕاهـێنـانـی دەنگ بـەزمـانـی کـوردی دەخـەمـە بـەر دەستـی خوازیارانی ڕاهێنانی دەنگ، لەوانە "بنەما نوێیەکانی ڕاهێنانی زمان و ئاواز نووسینی ئیدوارد ڕۆسی"].

## پیتگەلی بێدەنگ وەك دژبەری ڕستە

بێگومان زاڵن بەسەر شێوەگوتنی پیتە بێدەنگەکانی نزیك لە یەك لە ڕستەکاندا، ب–، پ–، د،– ت–، گ–، ك–، ئەمەش تەواو وەك پرۆڤەی پێشووە. بۆ ئەوە دیسان تێکستەکەی پێشوو [بیم – بەم – بالیشە] بەکاربێنن. ئەو تێکستە بەدەنگێکی گەورەی پڕ بەتەنیا یان لەگەڵ هاوڕێکەت بەدوو قۆڵی بخوێنەوە.

لێرەشدا دەبێ ئەو پرنسیپانە بەکاربهێندرێ:

شل و ئازادبوونی شانەکان، کەرەستەکانی دەنگ و لێوەکانی (لیچ)ی سەر و خوار. تێکستەکان دووبارە بخوێنەوە و دەنگ بەرزکەوە و سەرنج بدە پیتەکان و دەنگی پیتەکان لە ڕستەکەدا. ئەم بەشە لە دەرسەکان لە لای بەشدارانی کۆرسەکانەوە زۆر پێشوازیی لێ کراوە، دەکرێ لە دوو یان چەند گرووپدا پرۆڤە بکرێ و بەشێوەی دڵخواز بەرزی و نزمی و بەهێزی و بێ هێزیی گوتنەکە تاقی بکردرێتەوە. بەڵام لە کاتی کاری گرووپیدا لێ گەڕێن، باهەر کەس ڕستەیەك بڵێتەوە. لە هەر حاڵدا ئەم پرۆڤەیە دەبێت لەبەر بگوترێتەوە، لەبەر ئەوەی لە ڕێگای کۆنتاکتی چاوەوە گرووپەکە ڕیتمی هاوبەش پەیدا بکات.

**بەکارهێنان و گۆڕینی تێمپۆ [خێرایی]**

ئێستا بەجێگای پیتی ب پیتی پ بەکاربێنن.

پیم–، پەم–، پۆلیشە

لە ڕێگای گۆڕینی ئەو پیتە، سەرجەم تێکستەکە کەسایەتییەکی دی وەردەگرێ. ڕستەکان قورسایی پێشووی خۆیان لە دەست دەدەن. خشینێکی کز لە دەنگدا پێکدێت، وەك ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی کە لە ڕێگای خشاندنەوە دەنگیان لێ بەرز دەبێتەوە. پیتی "پ" پێویستیی بەتیمپۆیەکی بەپەلەتر لە ڕستەکەدا هەیە. لێرەدا بۆ ئەوەی بیسەر لە

وتاربێژ بەباشی تێبگات، وتاربێژ دەبێ زیاتر لێوەکانی بەکاربهێنێ و ئەکتیڤتر دەم ولێوی بجوولێنێتەوە.

ئەم تێکستە بەپیتی "پ" بەتەنیا بخوێنەوە یان لەگەڵ هاوکارەکەت و یا لە گروویەکەدا، بەشێوەی پێشوو، هەر کەس ڕستەیەك بخوێنێتەوە. تیمپۆی خوێندنەوەکە دەبێ بەخێرایی بێ، تۆنی دەنگ دەبێ کز، بەڵام تەواو تیژبێت.

جارێکی دی پڕۆڤە بکەوە، بەڵام ئەو جار بێ گۆڕینەوەی ڕستەکان لەگەڵ هاوکارەکەت، بەڵام سەرجەم تێکستەکە دەبێ ڕوون و ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ بخوێندرێتەوە. دەبێ تێ بکۆشی لەگەڵ هاوکارەکەت یان لە ناو گرووپەکەدا، بەڕاستی دەقاودەق ڕاست پیت و وشە و ڕستەکان بخوێنییەوە، یا بیان ڵێیەوە. دەبێ لەگەڵ هەر پیت و وشە و ڕستەیەك، وەستایانە هەڵسوکەوت بکرێ. چاوپۆشین لە هەڵەی زۆر ورد و نابەجێ لێرەدا، دەبێتە هۆی هەڵەی گەورەتر لە کاتی وێژەری و وتاربێژیدا.

### دژبەری جووتە ڕستەی نوێ

بۆ ئەوەی ئیشی کارتێکردنی دەنگی پیتەکان ڕوونتر بێتەوە، درێژە بەپڕۆڤەکە بدەن. ئەمجارە جووتە پیتی "د-، ت-" بەکاربهێنن، لە بەرا پیتی: د- "دیم- دەم- دۆلیشە".

لێرەش دەبێ پڕئاهەنگ، ڕستەکان بخوێندرێنەوە و خێرایی دەبێ بەهەسپایی بێت و دەنگەکان هەتا دەکرێ پڕ مانا هەڵکێشرێ و بکێشرێتە بەرەوە.

پیتی ت: تیم-، تام-، تۆلیشە

لێرەدا ئەم پیتە دەخوازێ کە تیمپۆ زۆرتر بکرێ، بەڵام دەبێ بەوپەڕی لێزانییەوە بخوێندرێنەوە. ئێوە دەتوانن بەتەنیا پڕۆڤە بکەن یان دەگەڵ هاوکارەکەتان، هەرکەسە و ڕستەیەك. لە دووبارەکردنەوەی "تیم-، تام-، تۆلیشە"

دەبێ بەیەکەوە لە هاوئاهەنگیدا بیخوێندرێنەوە.

ئەم پرۆڤەیە بۆ دواجار بەدوو پیتی گ و ك درێژە پێ بدەن.

گ: گیم– گام– گۆلیشە.

لێرەش دەبێ بەدەنگی بەرز ڕستەکان بخوێندرێنەوە و تیمپۆ دەبێ بەهەسپایی بێت و دەنگەکان هەتا دەکرێ پڕ مانا هەڵکێشرێ و بکشێرێتەوە بەرەوە.

ك: کیم– کام– کۆلیشە.

دەنگی ڕەقی "ك" وادەکا کە بەتیمپۆی خێرا بخوێندرێتەوە. بەڵام دەبێ بەوپەڕی لێزانی بخوێندرێتەوە. ئێوە دەتوانن بەتەنیا پرۆڤە بکەن یان لەگەڵ هاوکارەکەتان، هەرکەسەو ڕستەیەك. لە دەوری دووەمدا بەیەکەوە، بەڵام هاوئاهەنگ بخوێندرێتەوە.

ئەگەر دەتەوێ بەباشی فێری وێژەری و وتاربێژی ببیت، دەبێ سەر لەبەری ئەم پرۆڤانە ئەنجام بدەی و هەوڵی ئەوە نەدەی باز بدەی بەسەر پرۆڤەکاندا. بێ فێربوونی ئەم بەشانە درێژەدان بەتەمرینەکان سوودی تەواوی نابێ و پێشکەوتن ئەستەمە.

ئەگەر تۆ ئاخر پرۆڤەت ئەنجام نەداوە و تەنیا خوێندووتەتەوە، تکایە بگەڕێوە و بەتەواوی پرۆڤەکە ئەنجام بدە و ئەوجا بەردەوام بەلە بەشەکانی تردا.

## ئاخافتن لە کاتی دیاریکراودا

لە پەیوەندی لەگەڵ کار و ژیانی ڕۆژانەدا، ڕەنگە ئێوە وەك قسەکەر، وێژەر و وتاربێژ، هان بدرێن لە کاتێکی دیاریکراودا، باسی بابەتێکی تایبەت و پسپۆڕانە بکەن. وای دادەنێین کە ئێوە ئەندامی بەڕێوەبەری ناوەندێکن و دەبێ لە کۆبوونەوەی گشتیدا ڕاپۆرتی چالاکییەکان بدەنە بەشداران. بۆ

ئەوە ١٥ دەقیقە کات بۆ ئێوە تەرخان کراوە. ڕەنگە ئێوە ڕووبەڕووی ئەم خاڵانەی خوارەوە ببنەوە:

* یا پاش تێپەڕبوونی ٥ دەقیقە، ئێوە ڕاپۆرتەکەتان کۆتایی پێ هێناوە، کە بەشداران دەپرسن لە ساڵێکدا ئەو ڕێبەرایەتییە چی کردووە.
* یان ئێوە لە ماوەی دیاریکراودا هێشتا تەواو نەبوون، کە ئەوەش وەبیر قسەکانی تۆخلۆسکیمان دەخاتەوە، کە وتاربێژێکی خراپ، کۆتایی بەقسەکانی دەهێنێ. پاشان لە سەرڕاوە دوبارەی دەکاتەوە و دیسان لە نیو سەعاتیشدا هەر تەواو نابێ. ئەمە دەتوانێ زۆرجار دووبارە بێتەوە.

ئەوەی لە کاتێکی دیاریکراودا باسێك پێشکەش بکرێ، داواکارییەکی گەورەیە، لە پڕۆڤەی خوارەوەدا مەسەلەی کات بەرچاوترە. گرنگیی ئەم بەشە خۆی لە هەڵبژاردنی تێم و بابەت و داڕشتنی ناوەرۆکدا دەبینێتەوە، کە وتاربێژ دەبێت بەسەریدا تەواو زاڵ بێت. لە پڕۆڤەکەدا بەشێوەیەکی گشتی تاقیکردنەوەی ژیان هەڵبژێردراوە بۆ ئەوە هەر کەس بتوانێ بەباشی باسەکەی گەڵاڵە بکات و پێشکەشی بکات. بۆ وێنە خوردببنەوە لەسەر ڕاپۆرتی سەفەرێك بەدوو شێوە: یەکەم لە دوو دەقیقەدا، باس لە بەشی سەرەکی لە فۆڕمێکی کورتدا بکەن کە تەنیا داڕشتنی وشە گرینگەکان بێت. بۆ شێوەی دووەم ٥ دەقیقە کاتتان هەیە، کە بەوردی باسی بابەتەکە بکەن. کەوایە لە پێشدا ڕاپۆرتێك دەدەن لە دوو دەقیقەدا کە وشە گرینگ و سەرەکییەکان لە خۆ دەگرێ. دوایە، ڕاپۆرتی دووەم لە ٥ دەقیقەدا کە بەوردی وەرنە سەر گێڕانەوەی سەفەرەکە:

**فۆڕمی کورت لە ٢ دەقیقەدا**

* وشە گرینگەکان
* دەستپێکێکی کورت، ناوی شارەکان و شوێن و جێگا بەرچاوەکان.

### فۆڕمی ڕەنگدانەوە لە ٥ دەقیقەدا

* وردیی باسەکە، ڕەنگدانەوەی تەواو

* دەنگدانەوەی ئەو شتانە کە خۆتان بینیوتانە، لێ زیادکردنی وردی شتەکان و باس لەو شوێنانە کە زۆر بەدڵی ئێوە بووە و ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی خۆتان لەو سەفەرەدا.

## بەراوردکردنی دوو سەفەرنامە

ئەم سەفەرنامەیەی مەکزیك لە نووسینی بەشداریێکی یەکێك لە دەورە (خول)کانی فێربوونی هونەری وێژەری و وتاربێژییە. بۆ پێشکەش کردنی تەنیا لە کوتە کاغەزێك کەڵك وەرگیراوە، ،ئەویش بۆ نووسینی وشە گرینگەکان لە هەردووك فۆڕمەکەدا!

ئەو تێکستە بەدەنگی بەرز لە ماوەیەکی دیاریکراودا بخوێنەوە و پاشان هەردوو فۆڕمی کورت و درێژ لەگەڵ یەك بەراورد بکە.

## سەفەری من بۆ مەکزیکۆ [فۆڕمی کورت ٢ دەقیقە]

بێ گومان ئێوەش هەر وەك من بیر دەکەنەوە: مرۆڤ سەر لەبەری ساڵ دڵی بەو سەفەرەی کە لە ڕێی دایە، خۆشە. سەفەری من بۆ مەکزیکۆ کە ئێستا دەمەوێ بۆ ئێوەی بگێڕمەوە، بۆ من تاقیکردنەوەیەکی پڕ بایەخ بوو. مانگی ئۆکتۆبەری پار، ئێمە لە فرانکفۆرتی قەراخ "ماین"ەوە بەفڕۆکە فڕین بۆ مەیامی لە فلۆریدا. ڕۆژی دوایی، بەشداریی گەڕانێکی ناو شارمان کرد و پاشان فڕین بۆ شاری جیهانیی مەکزیکۆسیتی. لەوێ ئێمەیان گەیاندە [گراند هوتێل]. بەیانی ڕۆژی دوایە، سەردانی موزەی نیشتمانی و گۆڕەپانی سێ فەرهەنگمان کرد. پاش نیوەڕۆ، بردیانین بۆ موزەی [ئانترۆپۆلۆژی] کە بۆ ئێمە بەتایبەت سەرنجڕاکێش بوو، چاومان

بەساڵنامەی [ئاتستێك] کەوت بەقورساییی ٢٢ تۆن کە لە بەرد ساز کرابوو و هەروەها پەیکەری خودای باران [ئاتستێك] کە لەبەر دەرگای دەرەوە داندرابوو. ئێوارەی ئەو ڕۆژە، بەشداریی پرۆگرامێکی فۆلکلۆریمان کرد وچێژمان لەو بەرنامە مۆسیقایەی کە لە کاتی نانخواردنی ئێوارەدا پێشکەش کرا، وەرگرت. لە ڕۆژەکانی دوایە، سەفەری [تەئۆتیهوئاکان]مان کرد کە شارێکی کۆنی خواکانە، کە بەهێرەمەکانی مانگ و ڕۆژ، بەناوبانگە، پاشان چووینە [تاکسیکۆ]، شارۆچکەی زێوین و لەوێشەوە چووین بۆ حەمامی جیهانی و [ئاکاپولکۆ] بەهوتێلە لوکسەکەیەوە، کە ڕاست لە قەراخ دەریا هەڵکەوتووە. لێرە بێگانەکان دەتوانن خواردنی عەجایب سەیروسەمەرە بخۆن. پاش مانەوەی دوو ڕۆژی پڕ لە مەلەکردن، بەنابەدڵی، دەبوو، ڕەوانەی وڵاتی خۆمان بینەوە. لە گەڕانەوەدا پاش دوو ڕۆژ وەداکەوتن گەیشتینەوە فرانکفورت. ئەمە سەفەرێکی پڕ دەردی سەر بوو، بەو حاڵە بۆ ئێمە هۆی بەرین کردنەوەی ژیان و دەوڵەمەندکردنی تاقیکردنەوەکانمان بوو.

## سەفەری من بۆ مەکزیکۆ [ڕەنگدانەوە لە ٥ دەقیقەدا]

بیگومان ئێوەش هەر وەك من بیر دەکەنەوە: پاش ماندوویەتی لە ئیش و، کاروباری بنەماڵەدا، بۆ دەرکردنی شەکەتی و بەخشینی تین و تارێکی نوێ بەژیان، مرۆڤ کەیف خۆش دەبێت بەوەی چاوەڕوانی کۆتایی پێ بێ و بەرەو سەفەر بکەوێتە ڕێ. سەفەری من بۆ مەکزیکۆ، کە بۆتانی دەگێڕمەوە، سەرەڕای ئەو گیروگرفتانەی کە هاتە سەر ڕێمان، ژیانی ئێمەی لە ئەندازەیەکی زۆردا فراوانتر کردەوە کە بەڕاستی بایی ئەو هەموو زەحمەت کێشانە دەبوو.

ئۆکتۆبری ساڵی ڕابردوو، ئێمە لە فرانکفۆرتی قەراخ ″ماین″ەوە بەفڕۆکە فڕین بۆ ئیرلەند، لە شاری [شانۆن] ماوەی سەعاتێك وەستانی

ترانزیتمان هەبوو، پاشان بێ وەستان درێژەمان بەسەفەرەکەمان دا بۆ شاری [مەیامی بەئاخ] لە فلۆریدا. ڕێگای چەند سەعات ئێمە، زۆر زوو بڕایەوە، لەبەر ئەوەی لە لایەن میوانداراانی لوفت هانزای ئەڵمانەوە زۆر میوانداریمان لێ کرا. لەم ماوەدا فیلمیان نیشان داین و بەوجۆرە بێ ئەوە بێ تاقەت بین گەیشتینە شاری مەیامی. ڕۆژی دوایە گەڕانێکی ناو شارمان کرد. لەبەر ئەوەی من ساڵی پێشوو هاتبوومە فلوریدا و بەڵام نەمتوانیبوو، هەموو شارەکە بگەڕێم، زۆرم پێ خۆش بوو ئەو شوێنە بەناوبانگەی مەلە و حەمام کردن لەگەڵ باڵەخانە بەرزەکانی ببینم. بەڵام لە هەمان ڕۆژدا مەجبوور بووین زۆر شوێنی تریش ببینین: لە سەفەرێکی سێ سەعاتەدا، گەیشتینە شاری بەناوبانگی جیهانی مەکزیکۆسیتی. لەوێ گوێزراینەوە بۆ گراند هوتێل. لە ئێوارەدا بۆ خۆمان پیاسەیەکی ناو شارمان کرد. ڕۆژی پاشان بەگەڕانێکی چوار سەعاتە دەستی پێ کرا، کە ئێمەی لەگەڵ شوێنی زۆر خۆش وەك مووزەی نیشتمانی و مەیدانی سێ کولتوور ئاشنا کرد. لووتکەی گەڕانی ئەو ڕۆژەمان پاش نیوەڕۆ بوو کە سەردانی موزەی ئانترۆپۆلۆژیمان کرد، کە بەیەکێك لە جوانترین موزەکانی جیهان دەژمێردرێ. بۆ وێنە لێرە مرۆڤ ساڵنامەی [ئاتستێك] دەبینێ کە قورساییەکەی ٢٢ تەنە و لەبەرد سازکراوە، ئەوەی کە بۆ ئێمە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو پەیکەری خودای باران بوو کە لە بەرد چێ کرابوو و لەبەر دەرگای سەرەکیی مووزەکە داندرابوو. کۆتاییی ڕۆژەکە، سەردانی شەوێکی فۆلکلۆری بوو کە خواردنی پێش وەخت بوو و بیستنی مۆسیقا، کە بۆ ئێمە جێگای کەیف خۆشی بوو.

درێژەی سەفەرەکەمان سەردانی شاری کۆنی خوداکان بوو، بەناوی [تەئۆتیهوئاکان]. ناوەندی ڕێوڕەسمەکان لە ڕێگای شەقامی خودایانەوە کۆتایی پێ دێت و هێرەمە بەناوبانگەکان بەناوی مانگ و ڕۆژ خۆیان

وەدیار دەخەن. ئەم مەڵبەندە، گەلێك دیمەنی دڵڕفێن لە ناو وڵاتێکی شاخاویدا، پێشکەشی بینەر دەکات.

ڕۆژی دوایە بەپاس بەرەو [تاکسیکۆ] کەوتینە ڕێ، شارۆچکەیەکی کۆنی زێوین، کە لە سەردەمی [کۆرتیتس]دا بەشوێنە زێوینییەکانییەوە بەناوبانگ بووە. [تاکسیکۆ] ئێستاش هەر وەك زەمانی زوو بەکۆڵانە تەنگەکانییەوە پارێزراوە. لە زۆربەی دووکانەکاندا هونەری کاری دەست لە زیو ئەنجام دەدرێ. ئەم هونەرە دەستییە، وای لە منیش کرد کە بۆ کڕین، بچمە ناو ئەو دووکانانەوە.

بەناو ڕێگا شاخاوییەکانی [سیرا مادرێ]دا پاسەکە، ئێمەی گەیاندە شاری [ئاکاپلۆ]. لەو شوێنە مەلەیەکی زۆر خۆشمان کرد، دەکرێ مرۆڤ بڵێ ڕامان بوارد. لەبەر ئەوە تەواوی سەفەرەکە بەپێی بەرنامەیەکی چڕوپڕ دارێژرابوو.

شوێنی مەلە و حەمامی ناوداری جیهانی [ئاکاپولکۆ] دەکەوێتە پاڵ دەریا، شوێنێکی خەیاڵ ئامێزی جوان. لە پاڵ ئەو دەریایەدا، گەلێك شوێنی زۆر جوان بەرچاو دەکەون بۆ پیاسەکردن بۆ ئەوە بەشێکی قەراخ دەریا بەستراوە. ڕاست لە پاڵ دەریا سەدان ڕێستوران چاوەڕێی مشتەری دەکەن کە خولیای خواردنی ئەم مەڵبەندەن. لێرە گەلێك خواردنی سەیروسەمەرە بەشێوەی زۆر تایبەت لێ دەندرێن و دەخورێن. پاش مانەوەی دوو ڕۆژی تر و مەلەکردن، بەناچاری دەبوو بەرەو وڵات بگەڕێینەوە. جێگای باوەڕە ئەگەر بڵێم کە ئێمە حەزمان دەکرد چەند ڕۆژی تر بمێنینەوە. بەڵام بەنابەدڵی دەبوو سواری فڕۆکە بین بۆ گەڕانەوە، بەڵام لە فڕۆکەخانەی مەکزیکۆسیتی بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، دیتمان، هیچ فڕۆکەیەك نییە پێی بگەێینەوە، فڕۆکەکە خراببوو و کاری ئێمە چەتی تێ کەوتبوو. هەرچەند گوێزراینەوە بۆ هوتێلێکی دەرەجە یەك بەڵام بەهۆی نەبوونی کات هیچمان

بۆ نەدەکرا. دیار نەبوو کە تەیارەکەی ئێمە کەی دەتوانێ هەڵفڕێ. پاش دوو ڕۆژی ماتڵ بوونی، سەرئەنجام گەیشتینەوە فرانکفۆرت. هەرچەند سەفەرەکە تێکەڵ گیروگرفت بوو بەو حاڵە لەسەر یەك سەفەرێك بوو کە ئاسۆسی ژیانی ئێمەی گەلێك بەرینتر کردەوە.

### بەراوردکردن

دوور لە ناوەرۆکی نووسراوەکە، ئایا خۆتان لە نووسراوەکە بە نزیك دەزانن یان نا، بەراوردکردنی دوو فۆڕمی کورت و درێژ، بۆ ئێوەی دەردەخات کام لەو فۆڕمانە سوود بەخشترە.

## وتاری خۆت

ئێستا نۆرەی ئێوەیە: بابەتێك هەڵبژێرن بۆ فۆڕمی ۲ دەقیقەیی و ۵ دەقیقەیی، حەول بدەن هەر لە هەر دەستپێکەوە بیسەر بۆ لای خۆتان ڕابکێشن.

### دەستپێك بۆ نووسینی سەفەرنامەیەك

ئەگەر ئێوە، خانمان و ئاغایانی بەڕێز، ئەمڕۆژانە سەرنج بدەنە پڕۆگرامەگەلی سەفەری ئاژانسەکانی سەفەر کە هەڵیان واسیون یان لە ویترینی دوکانەکانیان لەبەر چاوی خەڵکیان داناوە، دەبینن سەفەرکردن زۆر ئاسان بووەتەوە. سەفەری هەڵبژاردەی ئێوە بەدەست پێوەنانی دوگمەکەیەوە بەستراوەتەوە: ئەمڕۆ پارەکەت دەدەی و سبەی یەك ڕاست دەگەیە شوێنی سەفەرەکەت. هەر بۆیە من دەمەوێ سەفەرنامەی خۆم بۆ ئێوە بگێڕمەوە و نیشانی بدەم کە سەفەرکردن جاڕزبوون نییە و بەڵکو پشوودانێکی بەڕاستییە.

## کورتە نووسینی وشەکان یارمەتیدەرە

بەر لەوەی بچنە ناو گێڕانەوە و نووسینی سەفەرنامەکە، دەبێ بزانن کە چ شتگەلێك شیاوی گێڕانەوەن. خاڵە سەرەکییەکان لە لاپەڕەیەکدا تەنیا و تەنیا وەك وشە و نەوەك ڕستە بنووسن. ئەم وشانە بۆ گێڕانەوەی زارەکی [شفاهی] زۆر یارمەتیدەرن، بینینی ئەو وشانە ئێوە وەبیر ڕووداوەکە دەخاتەوە. وشەگەلی تایبەت بەفۆڕمی کورت و فۆڕمی درێژ جیاکەنەوە.

## کورتە وتار

* وشە گرینگەکان لە کورتە لاپەڕەیەکدا دەنووسی. ئەم وشانە تایبەتن بەو خاڵە سەرەکییانەی کە پەیوەندییان بەسەفەرەکەی ئێوەوە هەیە. [ئێمە لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبە دێینە سەر کارکردنی ئەم وشانە.]
* لە پێش خۆتان سەعاتێك کە چرکەژمێری هەبێت، دادەنێن و دەست بەگێڕانەوەی سەفەرنامەکە دەکەن بەپێی ئەو خاڵانە کە دەستنیشانتان کردوون، دەبێ لە بیرتان نەچێ هەر شتەی لە جێگای خۆیدا باس بکرێ و بەپێی ئەو خاڵانە بێت کە ڕیزی قسەکانی ئێوە دیاری دەکات.
* بۆ گێڕانەوەی ئەم سەفەرنامەیە لە ناو کورسییەکدا پاڵ مەدەنەوە، بەڵکو هەستنە سەرپێ، ئێوە بۆ خەڵك، بۆ هاوکارەکەتان یان بۆ گرووپەکەتان قسەدەکەن، کۆنتاکتی چاوتان لەبیر نەچێ. ئەگەر قسەکانتان بەڕاوەستانەوە ئازادانە پێشکەش کردو و عادەتتان بەوە گرت کە ڕاوەستن و قسان بکەن، پاشان زۆر ئاسانتر، بۆتان دەلوێ لە بەردەم جەماوەر ڕاوەستن و ئازادانە بدوێن.
* هەوڵ بدەن ناوەرۆکی قسەکانتان تەواو لە دوو دەقیقەدا جێ بکەنەوە و دواقسەتان بەڕستەی کۆتایی خەلاس بکەن، لەگەڵ دوایین ڕستە دەبێ تۆنی دەنگ کزتر بێتەوە و دابەزێ، بەوەش کۆتاییی قسەکان نیشان دەدرێ.

که بەئامانجی خۆت که باسکردن لەسەر بابەتەکە بوو، لە ماوەی دیاریکراودا، گەیشتی و ڕازی بووی لە کارەکەت، ئەوە بەشی دووەم ئەنجام بدە.

**وتاری درێژ**

* نووسینی خاڵەکان، واتە وشە گرینگەکان
* ئێوە بەوردی باسی سەفەرەکەی خۆتان لە ماوەی ٥ دەقیقەدا، کە ئەوپەڕەکەی بگاتە ٦ دەقیقە، بکەن.
* بەئەرکی خۆتانی بزانن کە بەوردی باسی ڕوداوەکان بکەن، هەر بەشەی بەجوانی بڕازێننەوە و بچنە ناو وردەشتەکان، بەچەشنێك گێڕانەوەکە لە فۆڕمی یەکەم دەوڵەمەندتر بێت.
* لێرەش ڕستەی کۆتایی دەبێ بەهای خۆی پێ بدرێ و تەکنیکی کۆتایی قسەش بەکاربهێندرێ.

پاش کۆتایی هاتنی وتارەکە، دەبێ دەورەکە بدرێ بەهاوکارەکەتان یان کەسێك لە بەشدارانی گرووپەکە، هەڵبەت ئەگەر ئێوە لە وەختی خۆیدا قسەکانتان کۆتایی پێ هێنابێت

## هەڵە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم پڕۆڤەیەدا

لە فۆڕمی یەکەمدا مرۆڤ دەخوازێ باسی مەبەست و ئامانج بکات و بەوەش دەیەوێت لە کاتی دیاریکراو لابدات. بەپێچەوانە، لە بەشی دووەمدا مرۆڤ دەیەوێت ٥ دەقیقەکە لە سێ دەقیقەدا تەواو بکات.

ئەگەر ئەم هەڵەیە لە لای ئێوەش دەرکەوتووە، خۆتان سەرزەنشت مەکەن. کەسانی بەر لە ئێوەش ئەو حاڵەتەیان بۆ پێش هاتووە. باشتر ئەوەیە هەردووەك فۆڕمی یەك و دوو بنووسنەوە. یەك ڕستە لە فۆڕمی

یەکەمدا بەرامبەرە لەگەڵ پاراگرافێك لە فۆڕمی دووەمدا. لە ڕێگای بەراوەرد کردنی ئەم دوو نووسینەوە، بۆتان دەردەکەوێ کە ئایا ئێوە دەتوانن پڕۆڤەکە لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدەن یان نا. کاتی ئازاد قسەکردن، ئێوە بەپێی وشە سەرەکییەکان ڕستە ساز دەکەن، کە لە ڕاستیدا دووبارە کردنەوەی نووسراوەکەیە. [مرۆڤ بەخۆڕاهێنان دەتوانێ فێربێت وشە و ڕستەکان لە کاتی دیاریکراودا بۆ ئەو مەبەستەی کە دەیەوێت بەباشی بەکاربهێنێت. وەك ئەڵمانی دەڵێن: بەپڕۆڤە کردن دەبی بەوەستا]

وانەی ٤

# هێز و باوەڕ بەخۆ

″من دەتوانم″، هێزی باوەڕبەخۆ، پێوانەیە بۆ هێزی کار بەئەنجام گەیاندن، کە هونەر و زانست بەمن دەبەخشێ. [فریدریش ڕوکێرت]

″من دەتوانم″ تاقیکردنەوەیەکی شادیهێنەرە. قسەکانی ڕوکێرت، هەموو بەشەکان لەخۆی دەگرێ، لە کارگەلێکی گشتییەوە هەتا دەگاتە هەر چەشنە کارێکی دەستی، هونەری و یا زیهنی. ئەم جووتە وشە نادیارە «من دەتوانم» پێداویستی سەرکەوتن و بوون بەوەستای وتاربێژی و پەیداکردنی هونەری وێژەری و قسەکردنە.

سەیری ئەم وشەیەی خوارەوە بکەن، بزانن چ کارتێکردنێکی خراپ لەسەر مرۆڤ دادەنێ: تۆ ناتوانی، هەر لە دەمی منداڵییەوە، هەتا فێرگە و قوتابخانە و کاتی دەرس و پاشانیش بەم دەستەواژەیە پێشت دەگرن و وەلات دەنێن و کارامەییت دەخەنە ژێر پرسیارەوە، کە ڕەنگە ببێتە هۆی دەستە وەستانی یان لە دەست دانی ورە.

ڕستەی ڕووخێنەری ″تۆ ناتوانی″، لە ناو لاوانی بەشدار لە کۆرسی فێربوونی هونەری وێژەری و وتاربێژی بەوە کۆتایی پێ دێت، کە هێزی فانتێیزی، کە هێشتا بواری دەرکەوتنی ئەو کەسەی کە تازە دەست بەفێربوونی هونەری قسەکردن دەکات تووشی دڵە ڕاوکێ دەبێت، ئەگەر بکەوێتە ئەو حاڵەتەوە کە نەتوانێ پێشبکەوێت. پاشان تێ دەگات کە دەبێ یارمەتیی خۆی بدات. ئەو فێردەبێ ئەگەر وێژەرێك و وتاربێژێك لە کاتی قسەکردندا، بۆ ساتێك سەری لێ تێك چوو، دەبێ درێژە بەقسەکانی بدات، بۆ ئەوە بارودۆخ هەڵگەڕێنێتەوە و دوبارە بکەوێتەوە سەر بابەتەکەی خۆی. لێرە دەبێ قسەکەر کەلەی ساردبێ و خۆی لێ نەگۆڕێ، دیسان بەچەشنێك بگەڕێتەوە سەر ناوەرۆکی باسەکەی خۆی، واتە بەجۆرێك

ئاخرین بەشی ناوەرۆکی باسەکەی دووبارە بکاتەوە. بۆ ئەوەی بیسەر هەست بەو گۆڕانە نەکات، دەبێ لە کاتێکی وادا بەڕستەیەکی دەستپێکانە دەست پێ بکەنەوە، کە لە هیچ حاڵەتێکدا بیسەر هەست بەو دووبارەکردنەوەیە نەکات. باشتر دەبێت ئەگەر ڕستەکە لایەنی شەخسی بەخۆیەوە بگرێ "من نازانم"، دوا قسەکانی من چەندە بۆ هەرکام لە ئێوە ڕۆشن بوون. من هەوڵ دەدەم جارێکی دی، بەوشەگەلێکی دی باسەکە ڕوونتر بکەمەوە هەر پاش گوتنی ئەم قسانە دەبێ درێژە بەقسەکان بدرێ، بۆ ئەوە دەرفەت نەدرێ کەسێك بیر بکاتەوە کە ئێوە تووشی هەڵەبوون. پاش ئەمە ئێوە کاتی تەواوتان هەیە، بۆ ئەوەی قسەکانتان درێژە بدەن.

## ئاوێتەکردنی تێکست

بۆ هەنگاوی یەکەم دەتوانی "ڕوکێرت" لە زەینی خۆتدا ڕاگری، بۆ ئەوەی ئەم وشە پۆزیتیڤەی "من "دەتوانم"، بەردەوام لەگەڵت بێ. ئەم بیرە سەرەکی و ڕێنموونکەرە، بەدەنگی بەرز دووبارەکەوە هەتا لەبەری دەکەی. ئەمە پرۆڤەیەکی گرانبەهای [مێشك]ە بۆ وێژەر و وتاربێژ. گەرەکە ڕۆژانە ئەم پرۆڤەیە دووبارەکەنەوە. کۆکردنەوەی قسەی نەستەق، لەبەرکردنی شیعر یان ڕووداوەکانی ناو ساڵنامە و لەو بابەتانە، بۆ ئامادەکردن و حازر و وەڵامدانەوە گەلێك پێویستە. باش وایە بۆ درێژە پێدان بەپرۆڤە کۆنسێنتراسیۆن، ئەم سێ ڕستەیەی خوارەوە بکەنە وێردی زمانتان.

لە پێشدا ئەم سێ ڕستەیە بەدەنگی بەرز بخوێنەوە:

**من بەباشی سەردەکەوم! من خۆم پێش دەخەم! نا، من کۆڵ نادەم!**

ئێستا قەڵەم و کاغەز بگرنە دەست و هەوڵ بدەن ئەم سێ ڕستەیە لە ناو مێشکتانەوە بهێنە سەر کاغەز.

## دەرکەوتنی باوەڕمەندانە و ئەرخایەن

پاش ئەوەی تێکستەکەت لە ڕێگای هێنانە سەر کاغەز ئاوێتەی مێشکی خۆت کرد، بیربکەوە، بزانە چۆن دەتوانی بۆ ئەو پرۆڤە جووڵە و حەرەکەت بەکاربێنی، هەرکام لە ڕستەکان بۆ خۆت بخوێنەوە، پاشان بەدەنگی زۆر بەرز لە ناو ژوورەکەتدا ڕستەکان بهێنە سەر زمان و گیانیان وەبەربێنە. لە کاتی دەرکەوتندا دەبێ هەنگاوەکانت زۆر باوەڕمەندانە هەڵهێنییەوە، نابێ بەهیچ جۆرێك ئەژنۆتان وشك و خاو بنوێنێ، ئەم خاڵە لاوازە دەبێ بۆ هەمیشە وەلا بنرێ. بۆ ئەوەی بەڕاحەتی بتوانی بجووڵێیەوە، دەبێ لە ژووری ماڵەکەتدا جێگای پێویستت بۆ پرۆڤە و جووڵانەوە هەبێ.

ئەگەر ژوورەکە بۆ ئەوە ببێت دوو یان چەند کەس تێیدا ڕاحەت بجووڵێنەوە، باشتروایە لەگەڵ هاوکارەکەت ئەو پرۆڤانە ئەنجام بدەی. لە بیرتان نەچێت کە هەردووکلا دەبێت بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە سەیری هەڵسوکەوتی یەکتر بکەن و سەیربکەن بزانن قسەکردن و جووڵانەوەکان لە جێی خۆیاندا ئەنجام دەدرێن یان نا. پرۆڤەکە دەبێت بەگوڕوتینەوە ئەنجام بدرێ، بەڵام بەهیچ چەشنێك نابێ دەسکرد، ئیشك یا سەربازییانە بێت. بەر لە هەر شت هەنگاوەکانی دەرکەوتن دیار و ڕوون کەنەوە. هەر دەم بەپێی ئەو بنەمایانە کە لە سەرەتاوە فێریان بووین بجووڵێنەوە، بۆ ئەم تەمرینەش لە هەمان پرنسیپ کەڵك وەربگرن.

**پرۆڤە یەك:** [**بەلاقی ڕاست دەست پێ بکەن**]

| | | | |
|---|---|---|---|
| من | بە | باشی | سەردەکەوم |
| ڕاست | چەپ | ڕاست | چەپ |
| لاقی ڕاست بۆ پێشێ و کورتە پشوو | | | |
| من | خۆم | پێش | دەخەم |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕاست | چەپ | ڕاست | چەپ |

لاقی ڕاست بۆ پێشێ و کورتە پشوو

| | | | |
|---|---|---|---|
| نا | من | کۆڵ | نادەم |
| ڕاست | چەپ | ڕاست | چەپ |

لاقی ڕاست بۆ پێشێ و کورتە پشوو

لەم پرۆڤەدا بۆ دەرکەوتنی باوەڕمەندانە و قورس و گران، ئێوە ناچار دەکرێن لەسەر جێگاکەی خۆتان ڕاست بنەوە و بەرەو شوێنی قسەکردنەکە بچن. ئەودەم بەپێی باوەڕی قورسی خۆتان دەچنە پێشەوە، نەك بەپێی گوتنی من بەباشی سەردەکەوم. ئێستا بە دەرکەوتنی ئەرخایەن و باوەڕمەندانە ئەم پرۆڤە ئەنجام دەدەن!

### پرۆڤە دووەم: [بەلاقی چەپ]

ئەو ترسەی کە زۆربەی وتاربێژ و وێژەرەکان لە دەستپێکی کارەکەدا، هەیانە لە دەم و چاویان ڕا دەخوێندرێتەوە. جارێکی دی ئەو پرۆڤەی سەرەوە دووبارەکەنەوە، بەڵام ئەمجارە لاقی چەپ لە پێشدا هەڵهێننەوە. لەم پرۆڤەدا کاتی هەنگاو هەڵهێنانەوە ڕاستە و ڕاست تەماشای پێشەوە بکەن، نەك تەماشای نووکی پێتان، هەروا کە ڕاست دەڕۆن تەماشای پێشەوە بکەن.

شێمایەکی وەك ئەوەی لە سەریدا کێشراوەتەوە سازبکەن بەپرۆڤە کردن، لە بیرتان نەچێ لە پێشدا هەنگاوی چەپ هەڵدەهێنەوە. ئەم پرۆڤە دەبێ لە لایەن ئێوە و هاوکارەکەتانەوە ئەنجام بدرێ.

## فانتێزی وەك پردێك

″من بەباشی سەردەکەوم″ ئەم ڕستەیە بۆ ئەم بەشەی پرۆڤەکەشمان بەکەڵك دێت، لەبەر ئەوە لەم بەشەدا قورسایی دەکەوێتە سەر لێهاتوویی خۆتان، کە ئازادانە دەور بگێڕن. لە بوارەکان جۆربەجۆرەکاندا دەردەکەوێ کە هەروەها لە لای ئەو مرۆڤە بیرمەندانەی کە لە بواری زۆر تایبەتدا کاردەکەن، فانتیزی جێگای خۆی هەیە. بەم جۆرە [ئیدوارد شپرانگێر]ی پێداگوگ، بوونی فانتێزی بەمانایەکی گەورە دادەنێ، کاتێك لەگەڵ شاگردەکانی کاری دەکرد دەیگوت:

″فانتێزی ڕزگاری دەبەخشێت! ئەگەر جێگای هونەری فانتێزی لە کولتوورێکدا چۆڵ بکرێ، کولتووری خەڵکەکەش بەگشتی دەکەوێتە بارودۆخێکەوە، کە ئیتر هەست بەوە دەکەن کە دوور لە ژیانی ئارەزوومەندانە دەژین، ئیتر تامەزرۆیی مانای نامێنێ، هەمووی ئەوانەش لە ئاکامدا دەروونی خەڵك تێك دەدات، لە خودی کەسەکانیشدا، ئەم حاڵەتە پەرە دەستێنێ.″

لە دوایین پرۆڤەدا کە سەبارەت بەباوەڕبەخۆ پەیداکردن و دەرخستنی توانایییە، دەبێ، ئێوە بۆ گرووپەکە چیرۆکێك بەشێوەی ئازاد بگێڕنەوە، تا بەوجۆرە هێزی فانتێزیی خۆتان ببزوێنن.

ئەگەر وابێ، قسەکەرێك، وێژەر و وتاربێژێك لە حاڵەتی خۆیدا بمێنێتەوە، خۆی لە حاڵەتی خۆیدا نوقم بکات، ناتوانێ خاوەنی دەربڕینی فانتێزیی خۆی بێ. ئێوەش پاشان لەگەڵ کەسانێك ڕووبەروو دەبن کە تێڕوانینی زۆر جیاوازیان هەیە و لە ئێوە تێ ناگەن.

لە ڕێگای ئەو تێکستەی خوارەوە ″ئەو منداڵەی کە بوو بەگورگ″ دەبێ ئێوە فێربن، هێزی فانتێزی خۆتان بەقەوەت کەن، بۆ ئەوە لە هەر کات و دەمێکدا کە ئازاد قسە دەکەن، بتوانن کەڵکی لێ وەرگرن. بەشی ناوەنجی

و کۆتاییی ئەم چیرۆکە، بەئانقەست ئاواڵە ماوەتەوە، ئێوە دەبێ خۆتان درێژەی پێ بدەن و تەواوی بکەن. بۆ ئەوەش ئێوە لێرە ئازادی تەواوتان هەیە! بەکورتی سەیرێکی چیرۆکەکە بکەن و پاشان باوەڕمەندانە دەربکەون و بەبەرزی و ڕوونی بیخوێننەوە.

## ئەو منداڵەی کە بوو بە گورگ

لە ماڵێکدا لە قەراخ دەریا، پیاوێك دەژیا، ئەو پیاوە نەخۆش بوو. ژن و منداڵیشی هەبوو. دوکتورەکان هاتن بۆ لای، ئەوان لەوێ ڕاوەستابوون، بەڵام نەیاندەتوانی یارمەتی بدەن نەخۆشەکە دەبوو بمرێ. هەر بۆیە تەواوی دەرگاکانیان ئاواڵە کردو و تەواوی کون و کەلێنی ماڵەکەیان کردەوە، هەتا ڕۆحی پیاوە نەخۆشەکە لە لەشی دەربچێ. پیاوە نەخۆشەکە جارێکی دی چاوەکانی تا ئەو جێگایەی بۆی دەکرا کردەوە و وتی: «من دەمرم، ژنەکەم بەم زووانە بەشوێنم دادێ، بەڵام ئێوە منداڵینە چیتان لێ بەسەر دێت؟ ئێمە مرۆڤە سوورپێستەکان ئیتر وەك جاران بەهێز نین. ئێوە نابێ لە یەك هەڵبڕن، منداڵینە گوێتان لەمنە!»

منداڵەکان گوێیان دابووە ئەو و گوتیان: «ئێمە هەرگیز لەیەك هەڵنابڕێن». ئەوان برا چکۆڵەیەکیان هەبوو. باوکیان دەستی نایە سەر سەری کوڕە چکۆڵەکەی و گوتی: «ئەمە بێ پەنا و بێ دەرەتانە، ئێوە نابێ بەجێی بهێڵن، هەتا کاتێك گەورە و بەهێز دەبێ».

براکان بەڵێنیان دا. پاشان پیاوەکە مرد. ئەوان گریان و ئەویان ناشت. پاش شەش مانگ دایکیشیان مرد. دیسان هەموو دەرگاکانی ماڵە چارداخەکەیان ئاواڵە کرد و لێ گەڕان ڕۆحی دەربچێ، بەڵێنیان بەویش دا کە لە یەك هەڵنەبڕێن. پاشان دایکەکەشان ناشترا. ئێستا تەواو بەتەنیا مابوونەوە.

برا گەورەکە تفەنگەکەی باوکی هەڵگرت و چوو بۆ ڕاو. خوشکەکەیان خواردنی لێ دەنا و ئاگای لە برابچکۆلانەکەیان بوو. ئەو زۆر لاواز بوو. بەڵام لە ئارامی و ئاسوودەییدا دەژیان و لە ئاشتیدابوون. زستان ڕۆیشت و بەهار گەیشت. هەموو شوێنێك گەرم و جوان بوو. براگەورەکە حەزی لەو تەنیاییە نەبوو و حەرزی دەکرد بە دنیادا بگەڕێ. ئەو بەخوشکەکەی گوت «ڕۆژەکان هەمووی لە یەك دەچن، لێرە تەنیا لێرەوار و دارستان هەیە، و هیچ ژن و پیاوێکی لێ نییە. دنیا پڕە لە مرۆڤ. خۆ نابێ ئینسان وەك ئێرە، دایم وسکوت بێ و تەنیا لەگەڵ خۆی قسە بکات، لە حاڵێکدا مرۆڤی دیکە لەو دنیایەدا هەیە.»

خوشکەکەی پێی گوت. تۆ ئیزنت نییە بڕۆی «ئێمە بەڵێنمان بەدایك و باوکمان دا، لەگەڵ یەکدا بمێنینەوە و ئاگامان لە برابچکۆلەکەمان بێت. ئەو لاوازە، دەبێ چی بەسەر بێت!» براگەورەکە بێدەنگ بوو. بەیانی ڕۆژی دوایە تیر و کەوانی هەڵگرت و لە ماڵ دەرکەوت. خوشکەکەی چاوەڕوان بوو هەتا ئێوارە، بەڵام ئەو نەهاتەوە. برابچکۆلانەکە براکەم لە کوێیە؟ خوشکەکەی پرسی ئەو وەڵامی دایەوە چووتە ناو خەڵکەوە و ئیدی نایەتەوە. قەت نایەتەوە؟ ئەو خراپە، تۆ دەبێ ئەو لە بیرخۆت بەریەوە. ئەو لە بیری چووەتەوە کە ئێمە چۆن بەڵێنمان بەدایك و باوکمان دا. پاشان براگەورەکەی بەنەعلەت کرد لەبەر ئەوەی بەڵێنەکەی خۆی لە بیربردبووەوە. بەڵام هەروەها لە ناو دڵیدا نائارامتر و نائارامتر دەبوو. بۆ بەڵێنێکی وامان دا، کە بردنەسەری ئاوا قورس و گرانە! ئەو گازندە دەکات. برا گەورەکەی من دوور لێرە لە ناو خەڵکدایە دەچێ بۆ ڕاو و کەیفی خۆشە، کاتێك لە نەبەرد دەگەڕێتەوە. ئەو لە تەنیشت ئاور لەگەڵ خەڵك دانیشتووە، گۆرانی دەڵێ و لەگەڵیان پێ دەکەنێ. کچان لە دەوری دەئاڵێن، و حەز دەکەن، ئەو بیانباتەوە بۆ ماڵە چارداخەکەی خۆی، براگەورەکەی من وەك پاڵەوانێك جێژن دەگرێ. بەڵام من لێرە دانیشتووم و دەبێ ئاگام

لە برابچکۆلانەکەم بێت.

ئەگەر ئەو بەم جۆرە درێژەی بەقسەکانی دابایە نائارامتر دەبوو. برا بچکۆلانەکەی خەمی ئەوی بوو. ڕەنگی دەموچاوی هەڵگەڕاو بوو، کاتێك دەوریـیـەکـانـی بـۆ خـواردن دادەنـا، وەك عـاقـڵـێکی نـائـارام شتێك هـات بەخەیاڵیدا. ئەو هەموو خواردەمەنیی ناو چارداخەکەی بوو کۆ کردەوە و لە شوێنێکی دانا. کە ڕۆژبووووەوە هەمووی خستە ناو دەسرە و قەرتاڵەوە، پێڵاوەکانی هەڵگرت و هەستا ڕۆیشت. برابچکۆلانەکەی لێی پرسی بۆ کوێ دەڕۆی خوشکێ؟. ئەو خەمناك بوو. ئەو ڕێگایە زۆرە بۆ تۆ تۆ بێ هـێزی، لاقـەکـانـت تـوێـان بـۆ هـەڵـنـاگـیری. کـەی دەگـەڕێـیتـەوە؟ کـاتـێك کـە براکەم دێتەوە. تۆ شتت بۆ خواردن هەیە و پێویست ناکات برسییەتی بـکـێشی. ئـەو قسەیـەی کرد و ڕۆیشت ئـیـتر نـەگـەڕایـەوە. بـرابـچـکـۆلانـەکـە خواردەمەنییەکەی خوارد و کاتێك هیچ لە ناو ماڵەکەدا نەما، دەرکەوت و خەمناك چووە ناو دارستانەکە بۆ پەیداکردنی میوە و بنچە گیا. ئێوارە گەڕاوە ماڵە چارداخەکە و دەستی کرد بەگریان. لەبەر ئەوەی خوشکەکەی نەگەڕابووووەوە...

[چیرۆکی سوور پێستەکان]

## کۆتاییی چیرۆکێك

هێزی فانتیزی خۆتان بەکاربێنن و بەشێوەی ئازاد چیرۆکەکە بەرەو کۆتایی بەرن. یا بەیەکەوە لەگەڵ هاوکارەکەتان پرۆڤە بکەن: هەر کام لە ئێوە درێژە بەچیرۆکەکە دەدات، هەتا دەگاتە ″سەر قسەیەکی تازە″، کە لێرەوە دەبێ ئەویتر درێژە بەچیرۆکەکە بدات، بەم شێوە هەتا کۆتاییی چـیـرۆکـەکـە دەڕۆن. ئـەم پـرۆڤـە دەگـونـجـێ بـۆ ئـەوەی لـە نـاو گـرووپـێکدا بەکاربێت. کەسەکان لە بازنەیەکدا بەرامبەر یەکتر دادەنیشن، کاتێك ″سەر قسەیـەکـی″ تـازە بـگـوتـرێ، دەبـێ ئـەو کـەسەی لـە دەستـە ڕاستـی قسەکـەر

دانیشتووه، درێژه بەقسەکان بدات. لێرەش کۆنتاکتی چاو لە نێوان هەموو بەشداراندا دەبێ لە ئارادابێت. زۆر بەباشی گوێگری قسەکانی کەسی پێش خۆتان بن لە کاتی قسەکردندا، بۆ ئەوە قسەکان بەباشی لە یەك گرێ دەن. ئێوە بەهیچ شێوەیەك نابی پێشتر باس لەوە بکەن کە چۆن دەست پێ بکەن، چۆن درێژەی پێ بدەن و چۆناوچۆن مامەڵە لەگەڵ چیرۆکەکە بکەن، فانتێزی هەر کەس دەبێ ئازادانە دەرکەوێ. هەڵبەت ئەگەر بتانەوێت سەرتاپای چیرۆکەکە ئازادانە خۆتان بیخوڵقێنن، دەبێت سەر دێری چیرۆکەکە وەك خۆی بمێنێتەوە: ئەو مناڵەی بوو بەگورگ. ئێستا دەتوانن دەست پێ بکەن. گەلێك خۆش بگوزەرێ لەگەڵ گێڕانەوەی چیرۆکی "ئەو مناڵەی بوو بەگورگ".

ئێستا کە تەواو بووی بەتەنیا یان لەگەڵ هاوکارەکەت دانیشە و بینووسەوە کەچی لەو پرۆڤە فێربووی بۆ ئەوەی وەك قسەکەر و وێژەر و تاربێژ کەڵکی لێ وەرگری یان وەك کەسێك کە لە گفتوگۆیەکی وادا بەشداری کردوە.

## ڕاهێنانی کۆنسێنتراسیۆن [تەمەرکوز - خوردبوونەوە]

پاش ئەنجامدانی پرۆڤەی فانتێزی و وەرگرتنی هێزی نوێ، تکایە هەر کەس بگەڕێتەوە سەر شوێنی خۆی. ئەگەر ئێستا شت یان شتگەلێك بکەوێتە دەستتان دەبێت دەست بکەن بەکایە و گەمەیەك کە بەکایەی کۆمەڵایەتی ناودێر دەکرێ و ناوی "چەمەدان (جانتا)تێ نێ" یە [بارگە و بنەتێك نێ]

ئەم پرۆڤە لەگەڵ هاوکارەکەتان یان لەگەڵ هەموو ئەو کەسانە کە حەزیان لێیە ئەنجام بدەن. ئێوە بیر لە شتێك دەکەنەوە بۆ وێنە جووتێك پێڵاو. پاشان دەست دەکەن بەگوتنەوەی ئەم ڕستەیە: من ئەم جووتە

پێڵاوە دەخەمە ناو چەمەدانەکەمەوە. بەشداری دوایە ئەم ڕستەیە دوبارە دەکاتەوە و ناوی شتێکی دیکەی لێ زیاد دەکات: من ئەو جووتە پێڵاوە و ئەو کاغەزی نامەیە و ئەو ئوتووە دەخەمە ناو چەمەدانەکەمەوە. ئەگەر باش خوردبنەوە و کۆنسێنتراسیۆنی باشتان هەبێت دەتوانن تا ١٥ ناو لە زەینتان ڕاگرن، هەرچەندە تێمی شتەکان تەواو لەیەکیش دووربن. کۆنتاکتی چاو لە زەیندا ڕاگرتنی ناوەکان ئاسانتر دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی هەر شتێك پەیوەندی بەیەکێك لە بەشدارەکانەوە هەیە، ئەو کەسە بۆ ئێوە دەبێتە نیشانەیەك بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو شتە.

ئەگەر ئەم کایەتان بەکەیفە، چەمەدانی فانتێزیتان پڕکەن لە شتی تر وەك پاپۆڕی هەوایی، کەشتی، ماشێن و هەر شتێکی دی کە بۆتان هەڵدەگیرێ. دەتوانن چەمەدانەکەتان پڕکەن لەو کەسانە کە دەتانەوێ بیانبینن: نووسەر، شاعیر، سیاسەتمەدار، هونەرمەند و ...

ئێستا چەمەدانەکەتان پڕکەن لەو شتانە کە ئابستراکتە وەك دۆستی، ئازادی، باوەڕبەخۆ و...

لێرەدا دەگەنە سەر بیری بنەڕەتی "وشە سەرەکییەکان"، کە لەو ڕێگایەوە زۆر ئاسان دەتوانن (برگە)ی خۆتان پەروەردە بکەن و پڕۆڤەی چۆنیەتیی فێربوون بکەن. هەر وشەیەك کە ئێوە لەم کایەدا [تەمرین] لە بیرتاندا ماوە، لە ڕاستیدا فێربوونی یەك وشەی سەرەکی یان وشەی دەستپێکە، کە دواتر دەتوانن لە ناو وشەکانی ناو دەستنووسە کورتەکانتاندا بیبیننەوە.

## وتار

بەبێ ئاسوودەبوونی ڕۆح، شتی مەزن ناکرێ، لەو شوێنە کە ئازادی نەبێ مرۆڤ تەفرو تونا دەکرێ و تەنیا کاری بچکۆلانەی پچڕ پچڕ ئەنجام دەدرێ. [فریدیش هێنریش یاکوبی]

ئەگەر ئێوە لە تەلەفزیۆن یان لە هۆڵی سیمینار، ڕەخنەگرانە وتاربێژ بخەنە ژێرچاودێریی خۆتان، لە پاڵ نموونەی بەڕاستی وتاربێژی باشدا، ڕووبەڕووی وتاربێژی ئاواش دەبنەوە: کە هەم خۆی هەم بیسەران زۆر بەپەلە لەسەر ڕستەیەکەوە بۆ ڕستەیەکی تر ڕادەکیشێ. تێگەیشتن لە بیروباوەڕی کەسێکی وا، تەنیا لە ژێر فشاردا ئیمکانی هەیە، واتە وتاربێژێکی وا بەگوێرەی پێویست، لەسەر شتەکان ڕاناوەستێ، ناسەکنێ! ئەو کەسە مانای قسەکانی فریدریش هێنریش یاکوبیی نەپێکاوە، کاتێك خۆتان ئەو حاڵەتەتان وەك وتاربێژ بۆ بێتە پێش، دەبێ زۆر زوو بەبەخشینی ئاگایانەی پشوودان، ئەو کاتە بەبیسەر بدرێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو شتانەی کە دەگوترێ وەری بگرێ.

ئەمە دەبێتە فشارێکی زۆر بۆ سەر بیسەر، ئەگەر وتاربێژ بەو شێوەیە قسە بکات، لە کاتێکی وادا دەبێ بەپەلە لە ڕستەیەکدا بۆ وتاربێژ بنووسرێت کە پشوو بدات و لە نێوان قسەکانیدا نوختەدانێ! لەو حاڵەدا ئەگەر ئەو کەسە پشوویەکی چەند چرکەییش بدات، گیروگرفت هەر دەمێنێ تا ئەو کاتەی خۆی ئەم هەستەی تێدا پێك بێت و کێشی پشوودان لە خودی خۆیدا بکاتە باوەڕ.

## کێشی پشوودان

ڕاگرتنی کێشی پشوودان، بۆ ئێوە وەك وتاربێژانی داهاتوو زۆر گرینگە، چەشنێك هەستپێکردن و حیسابکردن لە خۆتاندا بۆ پشوودان پێکبێنن. ئێوە ئێستا لەم "فابل"ە [چیرۆکە وێنەییە]دا کە لە نووسینی [ئێزۆپ]ە، پشوودانی بەجێ فێربن.

هاوکارەکەتان نابێ نووسراوەکە و وێنەکانی لە دەستدابێ، ئەو دەبێ لە ڕێگای قسەکانی ئێوەوە بتوانێ وێنەکان لە لای خۆی بنوێنێ، ئەو

وێنانەی کە لە دەستی ئێوەدایە. هەر بۆیە ئێوە دەبێ لە مێشکی خۆتاندا ئەو وێنانە وەك وێنەیەکی [نگاتیڤ – چاپ نەکراو] ببینن و بیدەنە هاوکارەکەتان. واتە ئێوە لە ڕێگای وشەوە وێنەکان دەناسێنن. لە کاتی کێشی پشووداندا دەبێت، بەگوێرەی پێویست کات بدەنە بیسەر بۆ ئەوە بتوانێ ئەو نگاتیڤە لە مێشکی خۆیدا ببینێ و وەك وێنە بیداتەوە دەرێ [واتە نێگاتیڤەکان لە ناو مێشکیدا ببن بەوێنە]. لە پێشدا دوور لە هاوکارەکەت چیرۆکەکە بخوێنەوە و ئەو جێگایانە کە دەبێ کێشی پشوودانی تێدابێت بەخەتێکی ڕاست [|] دیارییان بکە. ئەم خەتە ڕاستانە نیشانەیە بۆ ئەو پشوودانە کە دەبێ لە تێکستەکەدا لە بەرچاو بگیرێ.

## قەلە ڕەشە و گۆزەڵەی ئاو



وێنەی ١: قەلە ڕەشەیەك تونییەتی زۆری بۆ هێنابوو. لە دوورەوە چاوی بەگۆزەڵەیەکی ئاو لەسەر دیوارێکی بەردین کەوت.



وێنەی ٢: قەلە ڕەشە کەیفی سازبوو خیرا فڕی بۆ لای گۆزەڵەی ئاوەکە.



٣

وێنەی ٣: بەڵام ئەو نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە ئاوەکە.لەبەر قوڵە بوونی دەندووکی هیچ ئاوێکی بۆ خواردنەوە وەچنگ نەدەکەوت.



وێنەی ٤: قەلە ڕەشە کەیفی تێك چوو، فڕی و لەسەر چڵی دارێك بێدەنگ هەڵنیشت و کەوتە بیرکردنەوە.


٥

وێنەی ٥: لە ناکاو لەو نزیکانە چاوی بەخیز و وردکە بەرد کەوت. شتێك بەمێشکیداهات. چوو خیزێکی بەدەنووکی هەڵگرت.


٦

وێنەی ٦:فڕی بۆ لای گۆزەڵەی ئاوەکە و خیزەکەی هاویشتە ناوی. ئاوەکە تۆزقاڵێك بەرز بووەوە.


٧

وێنەی ٧: قەلەڕەشە چوو خیزێکی دی هێنا و دیسان خیزێکی دی. هەموو جارێك ئاوەکە هێندێك دەهاتەسەرێ.


٨

وێنەی ٨: کاتێك هەموو خیز و وردە بەردەکان کەوتنە ناو گۆزەڵەی ئاوەکە، ئاو گەیشتە لێواری گۆزەڵەکە. قەلە ڕەشەی زرینگ لە قەراخ گۆزەڵەی ئاوەکە هەڵنیشت وبەخەیاڵێکی ئاسوودەوە تێر تێر ئاوی خواردەوە.

**سەرنج لەسەر وتارەکە**

لە کاتی ″کێشی پشوودان″ گەرەکە هەردەم ئەوە لە بەرچاو بگرین، کە نابێ لە ناکاو لە کاتی وتنی دواوشە، یان لە ناوەڕاستی ڕستەیەکدا، دەنگ داکەوێتە خوار، بەڵکو دەبێ لە تۆنی خۆیدا بمێنێتەوە و بەرزاییی تۆنەکە بپارێزرێ.

دوو نموونە لە بارەی وێنەی ژمارە١:

**هەڵە**

لە دوورەوە لەسەر دیوارێکی بەردین
چاوی بەگۆزەڵەیەکی ئاو کەوت.

ئێوە لە ڕێگای ئەم گرافیکەوە دەبینن، کە دەنگ لە کاتی گوتنی چەند وشەی کۆتـاییدا دەکـەوێت. واتـە بـەکـارهـێـنـانـی "کێشی پشوودان" ئـیدی دەست نـادا.

## ڕاست

لە دوورەوە لەسەردیوارێکی بەردین چاوی بەگۆزەڵەیەکی ئاو کەوت

هـەوڵ بدەن بـەرزاییی دەنگتان وا ڕابگرن، کە لـە کۆتـاییی وشە یـان کوتێك لە ڕستەکە وەك خۆی بمێنێتەوە. لێرە وەك سەرەتای وانـەکانـەکان [قسەکردنی بوێرانە] ئـاخر وشە لەبەر بڵێنەوە، بەشێوەیەك کە میمیکی دەمـوچـاوتـان دەرکـەوێ و کۆنـتـاکت لـە تـەك خـەڵك یـان هـاوکـارەکـەتـان ئـەنجام بدرێ.

## لەسەر وێنەی دووەم

قەلە ڕەشە کەیفی ساز بوو، خێرا فڕی بۆ لای گۆزەڵەی ئـاوەکە.

لێ گەڕێن هـاوکـارەکـەتـان لـە ڕێگای ئەو زمـانـە وێنـەییـەوە بـەئـەنجـامدانی کێشی پشوودان، کاتی هـەبێت بۆ ئـەوە بتوانێت لـە ڕێگای بیرکردنـەوە، وێنەکە لە مێشکیدا بکێشێ کە چۆن قەلە ڕەشە بۆ لای گۆزەڵەی ئـاوەکە دەفڕێ.

## لەسەر وێنەی ٣

بـەڵام ئەو نەیدەتوانی خۆی بگەیێنێتە ئـاوەکە. چونکە دەندووکی قوڵە بوو.

لێرە ئێمـە دەبێ وێـنـەیەك بدەین بـەبیسەر کە لـە نـاوەرۆکدا تـەواو داخراوە. هـەر بۆیە لێرە بچـنـە سەر ڕستـەی دواتر، دوای ئـەوە لـە ڕێگای پشوودانـەوە، وەختی پێویست بدەن بەهـاوکـارەکـەتـان، بۆ ئـەوە وێـنەکە لـە مێشکی خۆیدا بکێشێ.

لەسەر وێنەی ٤

قەلە ڕەشە کەیفی تێکچوو، فڕی و لەسەر چڵی دارێك هەڵنیشت و کەوتە بیرکردنەوە.

چۆن دەتوانن ئەم تێکستە وەك وێنەیەك باس بکەن، بۆ ئەوە هاوکارەکەتان بەردەوام حەزی لە بیستنی درێژەی چیرۆکەکە بێت؟ دوو شێوە داڕشتن بۆ ئەم مەبەستە دەتوانێ لە بەرچاو بگیرێ:

یەکەم لە ڕێگای لە بەرچاوگرتنی کێشی پشوودان، کە لە کۆتاییی هەر ڕستەیەکدا ئەنجام بدرێ: قەلە ڕەشە کەیفی تێکچوو، فڕی و لەسەر چڵی دارێك بێ دەنگ هەڵنیشت و کەوتە بیرکردنەوە. ...[پشوودان]

دووەم لە ڕێگای دووجار پشوودان کە بەم جۆرە دەبێت:

قەلە ڕەشە کەیفی تێکچوو، فڕی لەسەر چڵی دارێك بێدەنگ هەڵنیشت... [پشووی یەکەم]

کەوتە بیرکردنەوە... [پشووی دووەم]

درێژەدان بەگوتنەکان لەسەر وێنەکانی دی، دەبێ بەپێی ئەم تەکنیکە بێت. ئەگەر ئێوە ئەم تەمرینە واتە پشوودان بەباشی ئەنجام بدەن لە داهاتوودا کاتی قسەکردن بەشێوەی ئازاد، یا هێنانەوەی قسەی کەسانی دی [سیتاد] لە وتارێکی زانستیدا، خەڵك شەکەت نابێ و هەوای گشتیی هۆڵەکە تێك ناچێ. لە کاتێکی وادا بەڕاستی وتاربێژی بۆ ئێوە دەبێتە دیالۆگ لە نێوان ئێوە و بیسەردا.

## ڕستەی کۆتایی

جێی سەرسووڕمانە کە هێشتا کەسانێك لە خوێندکارانی وتاربێژی لەم بەشەدا تووشی هەڵخلیسکان دەبن. وا وێ دەچێ کە ئەو کەسانە بەشداری کێبەرکێیەك بن، لەسەر یەك تیمپۆ لێ دەخوڕن، بۆ ئەوە بەخەڵاتەکە بگەن،

بۆشیان جیاوازی نییە کە وتارێکی نووسراو لەبەر دەستیان دایە یان وتارێك بەشێوەی ئازاد پێشکەش دەکەن، هەر بەم خێراییییە کۆتایی بەوتارەکەیان دەهێنن. لە حاڵێکدا ڕاست لە کۆتاییدا دەبێ کاتی پێویست بۆ وتارەکە تەرخان بکرێ، بۆ ئەوە زۆرترین کارتێکردن لەسەر بیسەر دابنێ.

* هەر لە سەرەتای ئامادەکردنی وتارەکەدا، دەبێ گرینگیی تەواو بدرێت بەداڕشتنی ڕستەکانی کۆتایی و دەبێ بەشێوەیەکی بەردەوام کاری بۆ بکرێ، کۆتایی گرینگترین و لە هەمان کاتدا دژوارترین بەشی وتارەکەیە.

ژیانی بەردەوامی هەر گێڕانەوەیەك لە بەشی کۆتایی دایە. بەشی دەستپێك و ناوەندی دەبێ ویست و حەزی بیسەر بەرزکەنەوە و هەتا کۆتایی ڕایگرن. لێرە لە حەکایەتەکەی [قەلە ڕەشە]دا وەك نموونەیەك دەتوانین دەستپێك و کۆتایی لە بەرامبەریەك دابنێین. خۆتان سەیری کەن، بزانن (ئێزۆپ) لە ڕستەی دەستپێکدا چی دەڵێت:

قەلە ڕەشەیەك توونییەتی زۆری بۆ هێنابوو.

بیسەری ئەم ڕستەیە دەپرسێ، چی ڕوودەدا، هەر بۆیە ئەو لەگەڵ چیرۆکەکە دەچێ و چاوەڕوانی درێژەی حەکایەتەکە دەبێ، هەر ئەوەیە کە دەبینرێ کەوانی کێشی چیرۆکەکە هەتا کۆتایی ڕادەگیرێ.

بەخەیاڵێکی ئاسوودە تێرتێر ئاوی خواردەوە.

بێگومان بۆ ئێوە ڕوونە، کە ڕستەی کۆتایی لە باری [تۆن و دەنگەوە] داناکەوێت و نابێ داکەوێت. زۆر لە فێرخوازانی وتاربێژی دووچاری هەڵە دەبن، ڕستەی کۆتایی وتارەکەیان نزم دەخوێنەوە و بەمجۆرە ترسێك بەر لە تەواو بوون لەخۆتان نیشان دەدەن کە بەرچاوە.

لەم نموونەوە لە بەرچاوتان بێ کە هەردەم هەوڵ بدەن کۆتاییی

وتارەکە پڕ مانا بمێنێتەوە و بەرچاو بکەوێ. بۆ ئەوە هەنگاو بەهەنگاو بڕۆنە پێش و وشە بەوشە دەنگ نزم بێتەوە، بەجۆرێك کە دەنگتان لە شێوەی کەوانێکدا ڕێگا ببڕێت و کێشی دەستپێکی کەوانەکە هێدی هێدی کەم کەنەوە. بەشێوەی کەوانی قسەکردن مانای ئەوە نییە وشەکان لە یەکتر هەڵبڕدرێن. کۆتایی تووشی کێشانەوەیەك دێت، هەر وەك چۆن لە بەرهەمێکی مۆسیقادا لە بەشی کۆتایی [تاکتی ئاخر] هێدی هێدی نەرم دەبێتەوە. چەند جارێك پرۆڤە بکەن با هەستی پێ بکەن، هیدی هێدی قسەکردن یانی چی. لێرە دەبێ ئێوە لە مەرتەبەی چوارەوە بێنە پلەی سێ، پلەی دوو، پلەی یەك و پاشان بێدەنگی:




## کۆنتاکتی چاو و پشوودان

ئێستا بەو تێکستانەی کە پێتە برۆ پێش و دەرکەوە، چیرۆکی [قەلە ڕەشە و گۆزەڵەی ئاو] بەشێوەیەك بخوێنەوە، کە کۆنتاکتی چاو لەگەڵ هاوکارەکەت کاتێك کە دوا وشەکانی سەبارەت بەهەر کام لە وێنەکان دەکەوێتە سەر زار پێك بێت.

لە ڕێگای کۆنتاکتی چاوەکانەوە دەکرێ بزانرێ کە ئایا ناوەرۆکی باسەکە وەرگیراوە. ئێوە بەخێرایی و بەساکاری نیگاتان بۆ جەماوەری خۆتان فڕێ نادەن، زیاتر لەوە فێردەبن بەچاوەکانتان ئاکتیڤ بن، بەجۆرێك کە ببێتە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی زیندوو.

دەتانەوێ لە کاتی کۆنتاکتی چاو لەگەڵ بیسەران، کات لە دەست نەدەن و درێژە بەقسەکانتان بدەن، دەتوانن لە قامکە گەورەکانی دەستە چەپ و ڕاست کەڵك وەرگرن کە لەسەر ڕستەی مەبەست بۆ خوارێ دەجوولێنرێ.

پاش هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەگران، وەك هەردەم، ڕۆڵ دەگۆڕدرێ و هاوکارەکەتان جێگای ئێوە دەگرێتەوە، هەڵبەت ئیتر تێکستەکە بەدەست ئێوە نییە و لە دەستی هاوکارەکەتاندا دەبێت. وەك بیسەر دەتوانن باشتر کۆنتاکتی چاو لەگەڵ هاوکارەکەتان پێکبێنن. خۆ لە کۆنتاکتی چاو مەدزنەوە هەتا هاوکارەکەتان بۆی دەلوێ قسەکانی کۆتایی پێ بێنێ.

## وتاری وێنەیی و پێش بردنی قسە

بۆ ئەنجامدانی تەمرینی خوارەوە کۆمەڵێك وێنەی سروشت بەکەیفی خۆتان هەڵبژێرن تا بەکاری بێنن بۆ پێشکەش کردنی وتارێکی بێ تێکست. لەسەر ئەم وێنانە کورتە چیرۆکێك پێشکەش بکەن. وێنەکان دەبێت وابن کە ئێوە بتوانن لە ڕێگای ئەوانەوە ناوەرۆك بۆ چیرۆکێك ساز بکەن. ئێوە باسی سەفەرێکی خۆتان بۆ ناوچەیەکی شاخاوی دەکەن و بۆ دۆستەکەتانی دەگێڕنەوە، بۆ ئەوەش لە وێنەکان کەڵك وەردەگرن. بەوجۆرە کەسایەتییەکی شەخسی دەدەنە چیرۆکەکە. یا ئێوە کارمەندی ئاژانسی سەیر و سەمەرەن و بۆ مشتەرییەك باس لە چوون بۆ شوێنێکی شاخاوی دەکەن. بۆ پێشکەش کردنی وتارێکی ئەوتۆ هەوڵ بدەن باشترین بەشەکانی سەفەرەکە بگێڕنەوە. ئەم بەشانە زۆرتر قوت و زەق کەنەوە. ئەوەی وێنەکان چۆن ڕیزبکرێن و گێڕانەوەی چیرۆکەکە چەندە کات بگرێ، خۆتان بڕیاری لەسەر بدەن. پێویست ناکات بۆ باسکردن لە وێنەکان هەموویان وەك یەك بن و بەقەت یەك باس بکرێن، بەڵام لێ گەڕێن هاوکارەکەتان کاتی تەواوی هەبێت بۆ باسکردن لەسەر وێنەکان. ئەم پرۆڤە وێنەییە بۆ ئەو کەسانە باشە کە دەترسن و پێیان وایە لە نیوەی

گێڕانـەوەکـەدا دەمـێننـەوە، هـەر بـۆیـە پـێویست نـاکـات بـترسن لـێ نیشتن، کاتێك نەتوانن زۆر لەسەر وێنەیەك باس بکەن و زۆری لێ نازانن، لێ گەڕێن و وێنەیەکی تر باس بکەن.

* نەپەشۆکێن، ئەگەر نەتانتوانی لەسەر وێنە یەك دوو ڕستە زۆرتر باس بکەن.

## سڵاو و ناوهێنان

بۆ ناوهێنانی دانیشتووان، واتە بیسەران، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئایا ئێوە لـە کـاتـی ئـامـادەکـردنـی بـاسەکـەدا بـیرتـان لـەوە کردووەتـەوە یـان هـەر مـیـوانـێك و هـەر دانـیشتـوویـەك لـە هـۆڵـەکـەدا بـۆ ڕووتـێکردنـی شـەخسی سوپـاسگـوزار دەبـێ. بـۆ بـەخـێر هـاتـن و سڵاو لـێکـردنـی شەخسی لـە دانیشتووان باش وایە لە سڵاو کردنی شابلۆنی وەك ئەمە دووری بکەن: ئامادەبووانی زۆر بەڕێز، یان ئامادەبووانی خۆشەویست. هەوڵ بدەن بۆ بیسەرانتان گوتنێکی شەخسی بۆ قسەکردن بدۆزنەوە و ئەم پێشنیارانەی خوارەوە تەواوکەن:

**فۆڕمی ناوهێنان**

خۆشەویستانی وێنە دۆست...

خۆشەویستانی...

هاوکارانی خۆشەویست...

لە بیرتان نەچێ کاتی دەست پێ کردنی وتارەکەتان، ئەو شتەی کە لە بەشی دووەمدا فێری بوون واتە [دەست پێ کردنی وتارێك]: ئاوا دەست پێ نەکەن: من دەخوازم... بەڵکو لە ڕێگای دەستپێکەوە بیسەر دەکیشنە ناو باسەکەوە و یەکسەر دەچنە ناو باسەکە. لێ گەڕێن با چیرۆکێکی جوان بۆ دەست پێکردن بێتە زەینتانەوە.

## دارشتنی وتار

پێتان وانییە، بۆ وتاربێژ زۆر جوانترە بەچاو لە خەڵك كردن باسەكەی بەرێتە پێش هەتا سەر بەردانەوە و چاو چەقاندن. لە وێنەكە هەوڵ بدەن باس كردن لەسەر وێنەكان لە مێشكتاندا پێك بهێنن و پاشان بەچاو لە بیسەر كردن ئازاد قسە بكەن. ئەمە بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو وێنانەدا باشتر دەلوێ كە مرۆڤ خۆی وێنەكەی گرتبێت، بەوەش پەیوەندییەك لە نێوان وێنەكە و وێنەگردا هەیە كە یارمەتیی قسەكان و وتارەكە دەدات. هەڵبەت ئەم پەیوەندییە دەبێ لەگەڵ وێنەكانی تریش پێك بێت كاتێك كە ئێوە لە مێشكی خۆتاندا لە ڕێگای فانتێزییەوە باس لە وێنەكە دەكەن. ئەوەش گەلێك گرینگە كە سەرنج بدەنە ئەو [فرمان]ە كە بەكاری دەهێنن ئایا فرمانێكی گەرمە یان داكەوتووە، بیسەر گەلێك شادتر دەبێ، ئەگەر فرمانی زیندوو ببیستێت.

### ڕاست

هەتا گەیشتنی ئێمە بەو ڕوانگە پڕ بایەخە...

پاش هەڵكشانە سەرێكی دوو سەعاتە گەڕاینەوە ناو خێوەتەكە

وێنەی سڕ دوور لە ژیان و بەكارهێنانی پەیتا پەیتای [فیعلی یارمەتی] نیشانەیە بۆ زمانێكی ڕاوەستاوی دوور لە جووڵە:

### هەڵە

لێرە ئێمە خاوەنی ڕوانگەیەكی پڕ بایەخین

ئێوە لێرە ئەو خێوەتە دەبینن كە ئێمە تێیدا دەحەساینەوە

دارشتنێكی باش بۆ ئەو فیعلە بزوێنەرانە [چیابڕین، مەلەكردن، لوتكە...، ڕاكردن] لەو ڕستانەی خوارەوەدا بدۆزنەوە:

ئێرە شوێنی پاڵ قوچکی کلێساکەیە.

بەڵێ، ئێرەش پشتەوەی کلێسا بەناوبانگەکەیە...

## لکاندنی وێنە و بیر

ئەو جۆرە کە باوە کۆمەڵێك وێنەی هەڵگیراو لە پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا مانایەك پێك دەهێنن. بەڵام ئەگەر لە چاولێکردندا دەستبەجێ ئەو مانایە پێك نەهات، دەبێ تێ بکۆشن پەیوەندییەك لە نێوان وێنەکاندا پێك بهێنن. بۆ ئەوە نابێ ئێوە هەر وێنەیەك بەتەنیا هەڵئەنگاوتوو لەوی دی ببینن. ئێوە دەبێ بەپێی لێکدانەوەی زەینی خۆتان هەر وێنەیەك لەویدی گرێ بدەن. بۆ ئەوەی ڕوونتر بیتەوە، ڕەنگە نموونەی خوارەوە یارمەتیدەر بێ.

### ڕاست

″بەڵام نە تەنیا بۆ سەفەری ڕێپێوان و چیا بڕین، خەرجی زیاتر ناکەوێتە سەر شانی ئێوە، بەڵکو دەتوانن لە جیرانەتی ئەو شوێنە سەر سەوزەی قەراخ دەریا لۆتکە [بەلەم] بەقەرز وەرگرن و لۆتکە سواری بکەن.″

لێرە لکاندنی وێنەکان بەیەکەوە گونجاوە. وتاربێژ توانیویەتی پردێك لە نێوان وێنەکاندا ساز بکات. بیسەر پێویست ناکات باز بدات لە وێنەکەیەوە بۆ وێنەیەکی تر.

### هەڵە

لەو شوێنە جوانە لێتان دەگێڕێتەوە، بۆ چیا بڕین، بەسەر ئەم چوار شاخەدا. لێرە شوێنێکی پڕ لە سەوزاییی قەراخ دەریا نزیك ئەو شوێنە، لەوێ دەکرێ لۆتکە قەرز بکەی و لۆتکە سواری بکەی

لە نێوان دوو وێنەدا پچڕانێکی زمانی و بیرکردنەوەیی هەیە. بیسەر لەبەر نەبوونی پەیوەندیی نێوان وێنەکان دووچاری گرفتی تێگەیشتن

دەبێت. دەکرێ لە ڕێگای ڕستەی ناو ئاخنەوە وەك لەم ئەسنایەدا دیسان، ئەگەر پەیوەندیی مانایی لە نێوان وێنەکەدا ساز بکرێ. هەوڵ بدەن ڕستەکان وا دابڕێژن کە بیسەر تێ بگا و وێنەکان لە مێشکیدا وەك بیرەوەری بمێنێتەوە. پاش ئەم لێدوانە دەتوانن دەست بەوتارە زارەکییەکەی خۆتان بکەن. سەرنج بدەن بەتایبەت بۆ سازکردنی ڕستەی زیندوو و هەروەها پەیوەندی و لکاندنی فکریی وێنەکان لەگەڵ یەکتردا.

## وانەی ٥

# مانای ڕیتۆریك

فۆڕمی کۆنی هونەری ڕیتۆریك لە فەرهەنگی یۆنانەوە دیت، کە ڕۆمیەکان وەك فۆڕمی بەرزی هونەری خۆیان پەرەیان پیّ دا. لە ناوکی خۆیدا وەك هەر هونەرێکی دی لە دەروون و ناوەوەی خۆیدا خاوەنی قانوونێکە. بۆ وێنە چاو لە نیگارکێشی بکەن: هەر وەك چۆن وێنەیەك، دایم لە [تەواویەتی خۆی] پێك هاتووە، دەتوانیّ ئاواش وتارێکی ئازاد لە تاقە [بەشێك] پێك نەهاتبیّ کە لە ڕێگای ڕستەکانەوە وا ببیندریّ. هەموو بەشەکە بەتایبەت دەستپێك و کۆتایی، دەبیّ لە پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ یەکتردا ببیندرێن. بۆ هونەرمەندێکی نیگارکێش کە لە کاتی ئیشکردن دایە، و دەستەکانی بەئەرخایەنی بۆ کیشانەوەی فیگورێك دەسووڕیّ، دەزانیّ بەشەکانی دی، چۆن دابڕێژریّ. ئەو لە هەر قۆناخێکی کارەکەیدا کە لەسەر نیگارەکە دەزانیّ سەرجەم کارەکە چۆن دەردەکەوێت. هەڵبەت تەواوی وردەکارییەکان تەواو نازانریّ، بەڵکو سەرجەم داڕشتنەکە وەك یەکەیەکی بۆ نیگارکێش دیارە.

دەی باشە ڕیتۆریك لە وتارێکی ئازاد و زارەکیدا چۆن دەکریّ؟ کاتێك کەسێك دەست بەنووسینی وتارەکە دەکات، دەبیّ ئەوەی لە بەرچاو بێت، کە بۆ لای کام ئامانج و مەبەست وتارەکە دەباتە پێش. وتاربێژ، قسەکەر دەبیّ لە کاتی کارکردن لەسەر وتارەکە، تاقی کاتەوە کە ئایا یەکیەتیی دەروونی و ناوەکی لەناو وتارەکەدا بەدی دەکات یا نا.

## ئامادەکاری بۆ پێشکەشکردنی وتارێك

کیّ حەز دەکات دەست بکات بەپێشکەش کردنی وتارێك، بیّ ئەوەی بزانیّ، دەبیّ کام بیر لە بەشی سەرەکیی وتارەکەیدا هەبێت؟ هەر بۆیە ناکریّ لە

بەشی دەستپێکدا بەشی سەرەکیی وتارەکە کاری لەسەر بکرێت. ئەم کارە لە بەشی سەرەکیدا ئەنجام دەدرێ لە ڕێگای باسکردنی ڕاستەوخۆی وشە سەرەکییەکان و پێشکەوتنی پەیوەندیدار بەم وشانەوە کە هەنگاوەکانی بیرەکەش دەگرێتەخۆ. ئینجا دوای ئەو ئامادەکارییە دەکرێ دەستپێکی پێویست بۆ وتارەکە دابڕێژرێ. لە کۆتاییدا دەبێ جارێکی دی ئاوڕ لە بەشی سەرەکی وتارەکە بدرێتەوە و ئامانجی سەرەکیی وتارەکە دیار و ڕوونتر بکرێتەوە. بە سەرنجدانە سەر ئەو وتانەی سەرێ، ئێستا بەر لە هەر شت بەشی سەرەکیی وتارەکەتان ئامادە بکەن.

### وشەگەلی سەرەکیی یارمەتیدەری بیر و فکری وتارەکە

لەگەڵ [وشەی دەستنیشان] لە پەیوەندی لەگەڵ وێنەکان بەکەڵك وەرگرتن لە وێنە بۆ ئامادەکردنی وتارێك، کارتان کرد و دەرکەوت کە هەر وێنەیەك هاوتای بیر و فکرێکە. هەنگاوی دوای ئەوە بەکارهێنان و کارکردن لەسەر [وشە دەسنیشان] کراوەکانە بۆ ئامادەکردنی وتارێکی ئازاد [وتاری زارەکی].

بۆ ئەو مەبەستە تێمێکی ساکار [سوژە] هەڵبژێرن، تا لە سەری قسە بکەن، تێمێك کە ئێوە بەسەر ناوەڕۆکەکەیدا زاڵ بن. وشە گرینگەکانی ئەم بابەتە، کە نیشاندەری ناوەرۆکی سەرەکی بابەتەکەن لە کاغەزێکدا بنووسن، ئەم وشانە بە[وشەی دەستنیشان] ناو دەبەین. لە ڕابردوودا وێژەران و وتاربێژان هاوڕا نەبوون لەسەر ئەوە کە وتارێك بەتەواوی بەوردەکاریەکان و تەنانەت بەدیاریکردنی [چۆنییەتی خوێندنەوەی وشەکان] دابڕشترێ و فۆرمولە بکردرێ و بنوسرێتەوە، کە پاشان ئەونووسراوەیە لەبەر بکرێ و دوایە بەبێ کاغەز بخوێندرێتەوە.

ئەوەی وتاربێژ تووشی چ گرانییەك دەهات، ژان ژاك ڕۆسۆ باسی دەکات، ”کاتێك داوایان لێ کردووە بۆ پێشکەش کردنی وتار، هەمیشە

خۆی نەخۆش کردووە بۆ ئەوەی نەچێ.″

ئاگوست بێبل دەورگێڕی بەرامبەری (ئۆتۆفۆن بیسمارك) لە پەرلەمانی ئەڵمان، لە ساڵی ١٨٦٤ لە شاری لایپزیك لە کاتی پێشکەش کردنی وتار بەبێ کاغەز و لەبەر، کەوتە حاڵەتێکی ئابڕووبەرەوە. ئەو نووسیی:

مـن لـە نـاوەڕاستـی کـردنـەوەی بـاسەکـەمـدا تـێ چـەقـیـم و مـامـەوە. سەرئەنجامی ئەم کارە، ئەوەبوو کە من لە هەڵبژاردنەکاندا دۆڕاندم و [دۆلگە] بوو بەسکرتێری گشتی. لەو دەمەوە بەڵێنم بەخۆم دا، ئیتر قەت بەلای لەبەرکردنی وتاردا نەچم، بەم شێوە توانیم باش پێش کەوم.

## حەدی وشە سەرەکییەکان

بۆ ئەوەی کارەکە بەلاڕێدا نەچێ، دەبێ ئەلێرەدا دەست بۆ هەڵەیەکی گشتی کـە ڕوودەدا ڕادێریـن: نـووسیـنـی هـەمـوو دێرەکـان و پـاراگـرافـەکـان لـە چەندەها لاپەڕەدا. ئەمە بۆ وتاربێژ سوکنایيهێنەرە. وتاربێژ پێشتر ئەمە دەکاتە ئەرکی خۆی کە هەڵتەك هەڵتەك بچێت و دەست بکا بەخوێندنەوەی وشە بەوشە و دێر بەدێر. بەمجۆرە وتاربێژ خۆی دەکاتە زیندانیی ناو زیندانی خۆی.

هەر بۆیە هەر لە ئێستاوە فێربن کە فێرنەبن وتارێك لەبەرکەن یان وتارێك بەخڕی هەر لە نووکەوە تا کۆتایی بخوێننەوە.

نووسینەوەی سەرجەمی وتارەکە، وەك باس کرا، مێشك و بیری وتاربێژ بلۆکە دەکا، پێش بەوە دەگیرێ کە وتاربێژ بۆ پێشکەش کردنی وتارێك بـەگـوێرەی پـێویست ئـازادانـە بـیـر بـکـاتـەوە. نـووسیـنـی وشە گـرینگ و سەرەکییەکان لە کاغەزێکدا ئەو ئیمکانە دەدات بەئێوە، کە لە بەردەمی بیسەر و لەگەڵ ئەو بەیەکەوە بیر و فکرتان بەرەو ژوور هەڵکشێ.

بۆ نووسینی وشە سەرەکییەکان لە لاپەڕەی A٥ کەڵك وەرگرن، لەبەر ئەوەی گەورەیيی ئەو کاغەزە، بۆ دەست زۆر لە جێگای خۆی دایە. وشەکان

وا گەورە لە ژێریەکدا بنووسن کە خوێندنەوەیان ئاسان بێت. بەهیچ شێوەیەك لە بیرتان نەچێ:

* لاپەڕەی وشە گرینگ و سەرەکییەکان، لاپەڕەی دێرە [ڕستە] گرینگ و سەرەکییەکان نییە!!

## بەرین کردنی زانیارییەکان

کەڵك وەرگرتن لە کتێبی بابەتیانە گەلێك سوودمەندە، بەرهەمی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و هەروەها گفتوگۆی بابەتیانە لە بارەی تێم و بابەتێکەوە. ئەو بابەتە کە کۆتان کردووەتەوە، بەشێوەیەك بەشوێن یەکدا بیانهێنن، بەڵام پاشان بەپێی وشە گرینگەکان ڕێکوپێکیان بکەن و ڕیزکردنێکی مەنتقی [لۆگیك] بدەنە کۆکردنەوەکە.

لیستی وشە گرینگەکان دەبێ هەڵگری وشە گەلێکی [پاشەکەوت] بێت، کە وتاربێژ بتوانێ لە بارودۆخی تایبەتدا چاوپۆشی لێ بکات و ئەگەر پێویست بوو و کاتیش هەبوو بەکاربهێندرێ.

زاڵبوون بەسەر زانیارییەکان لەوانە زانیاریی ورد، یارمەتیی زۆری وتاربێژ دەکات و پشت ئەستووری دەکات بۆ سەرکەوتنی وتارەکەی. بێ شك بەشداری کردن لە کورس و دەورەی وتاربێژی و وێژەریدا تەنیا فێربوونی تەکنیك نییە. وتاربێژ وەك کەسایەتییەك دەبێ پرۆسەیەکی سوودمەند تاقی کاتەوە. هێزی خۆتان کۆ دەکەنەوە و فۆڕمی پێ دەبەخشن و لەوەش زیاتر زانینی خۆتان پەرەپێ دەدەن و خۆتەیار دەکەن. هەر بۆیە دەبێ بەردەوام پرۆڤە بکەن و بەردەوام پرۆڤە لەسەر ناوەڕۆکی وشە گرینگەکان بکەن.

## پرۆڤەی وشە گرینگەکان

دیسان قەڵەم و کاغەز بەتەنیا یان لەگەڵ هاوکارەکەتان بگرنە دەست،

یاخۆ لەگەڵ گرووپەکە وشە گرینگەکان لەسەر ئەو تێمەی خوارەوە بنووسن: وەرزش کردن – زیان یان زەرەر؟ هەوڵ بدەن بەشی سەرەکیی وتارەکە: بەو وشانە کە پەیوەندیان بەبەشی سەرەکیی وتارەکەوە هەیە، دیاری بکەن. هەڵبەت ئەوە زۆر یارمەتیی ئێوە دەدا کە تەنیا وشە گرینگەکان کە پەیوەندی بەبەشی سەرەکیی وتارەکەوە هەیە بنووسن و بیر لەو وشانە بکەنەوە و هیچ ڕستە و دیرێك مەنووسن. تکایە لە کۆتاییدا بەراوردی سەرجەم کارەکە بکەن، لەگەڵ ئەو وشە گرنگانە کە نووسیوتانە. لە کۆتاییدا کاتێك سەرنج بدەنە سەر ئەو نووسراوەیە، ڕەنگە لیستی وشە سەرەکییەکان بەو جۆرە کە لە سەرەتاوە ڕیزتان کردووە نەمێنێتەوە. ئەمە چاوەڕوان کراوە، لەبەر ئەوەی لە زۆر ڕێگاوە مرۆڤ دەگاتە ڕۆم.

**مەترسییەکانی وەرزش**

زیادە لە ئەندازە وەرزش کردن

زیاد لە حەد خۆ شەکەت کردن

برینداربوون و زیان گەیاندن بەپیشە و شوغڵ

چاوەڕوانی زۆر لە خۆکردن

مەترسی گیانی، هەڵدێران لە کەژ و چیاوە

**مانای وەرزش کردن**

هاوسەنگی لەگەڵ پیشە – بۆ ئەو کارانە کە زۆر دانیشتنیان تێدایە،

پڕکردنەوەی کاتی ڕابواردن

حەسانەوەی لەش

هەستکردن بەڕیتم

ناسینی تواناکانی لەش

کۆنسێنتراسیۆن [تەمەرکوز] – مامۆستایەکان شکایەتیان لە نەبوونی کۆنسێنتراسیۆن هەیە

دیسیپلین – پاڵ پێوەنان بۆ خۆ خستنە ناو ڕیزەکانەوە

بیرکردنەوەی گشتی و کۆمەڵایەتی – دۆستایەتی

تاقیکردنەوەی سروشتی

## گوتنی دەستەبەری سەرەکی

Mens sana in Corpore sano. [ئەقلێکی ساغ لە لەشێکی ساغ دایە]مانای بنەڕەتیی ئەم قسە ڕۆمییە ئەوە کە مرۆڤ لە خواکان داوای ساغیی لەش و دەروونی کردووە. ئەم قسەیە بۆ سەلماندنی وەرزش کردن مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە. ئێوە ئاشنان لەگەڵ فۆڕمی نووسینەوەی وشە گرینگەکان لە ژێر یەکتریدا، کە پاشان کۆمەڵە نموونەیەك بەشوێنیدا دێت. بەداخەوە زۆرجار دەبیندرێ ئەو کەسانەی کە تازە دەست دەکەن بەوتاربێژی ئەم بەشە، واتە هێنانەوەی وێنە و نموونە لە بەرچاو ناگرن و ون دەبێ و کەڵکی لێ وەرناگیرێ. بیسەر بەجێگای ئەوە کۆمەڵێك قسەی وشك کە زۆر جاران جووەوە، دەبیستێ و مەجبوریشە ئەم قسانە هەزم بکات. بیسەرانی خۆتان شاد بکەن بەو میسالانەی کە بیرتان لێ کردووەتەوە، ئەم میسالانە لە دەستە ڕاستی [دەستە چەپی] کاغەزەکەتان لەو شوێنە کە وشە گرینگەکانتان ڕیز کردووە بنووسن. ئەگەر ئێوە قسە گرینگەکانی بەشی سەرەکی وتارەکەتان نووسیبێت، بیر لەوە بکەنەوە تکایە، لە چ بوارێکەوە دەتانەوێ لەگەڵ خەڵك [بیسەران] قسە بکەن. چ شتگەلێك بەپێی ناوەڕۆك و شێوەی پێشکەش کردنی وتارەکە، دەبێ بیسەرانی ئێوە بۆ لای خۆی ڕاکێشێ؟ لێ گەڕێن ئەم فکرە ئەم بیرکردنەوەیە بەخەتی سوور نیشان بکرێ، دیاری بکرێ و چەند جارێك لە وتارەکەی ئێوەدا خۆی بنوێنێ، هەر جارە لە فۆڕمێکی گونجاودا، و لە

داڕشتنێکی تری وشە و ڕستەدا.

* ویست و داخوازیی سەرەکیی خۆتان لە پەیوەندی لەگەڵ وتارەکەتان بەخەت و ڕەنگی سوور بەکورتترین شێوە لە ژێر وشە گرینگەکاندا بنووسن و هەروەها لەسەر لاپەڕە نووسراوەکەتان نیشانەیەکی سوور لە هەموو ئەو شوێنانە دابنێین کە ئەم ویست و داخوازییە سەرەکییە، ئەم فکرە سەرەکییە دەبێ دووبارە بکرێتەوە. لە وتارەکەی بابەتی وەرزش، نیشانە لە پەنا هەموو ئەو وشە گرینگانە دابنێین کە فیکر و بیری سەرەکی [ئەقلێکی ساغ لە لەشێکی ساغ دایە] تێدایە. دەبێ بەچەشنێك باس بکرێ و دووبارە بکرێتەوە، کە لەو شوێنانەدا کارتێکردنێکی پۆزێتیڤ لەسەر بیسەر دابنێ. ئەگەر ئێوە بەپێچەوانە، دژی ئەم بۆچوونەن و پێتان وایە وەرزش ڕیسکێکی گەورەیە بۆ مرۆڤ و تووشی ئازار و نوقسانی دەکات، کە وایە لە پێشدا باس لە لایەنە سوودمەندەکانی بکەن و پاشان وەرنە سەر و ئەو مەترسییانەی کە وەرزش لەگەڵ خۆی دەیانهێنێ.

## دەستپێك

پاش ئەوەی بەشی سەرەکیی وتارەکەتان تەواو کرد، نۆرە دەگاتە بەشی دەستپێك و سەرەتای وتارەکە، کە دەبێ بنووسرێتەوە و دەقاودەق بیهێڵنەوە. لە ڕێگای دەستپێکی وتارەکەوە دەکرێ بزانرێ کە ئایا ئێوە بیسەران ئەکتیڤ دەکەن [وەجۆش دەخەن] بۆ ئەوەی حەز و خولیای گوێگرتن بۆ قسەکانتان پەیدا بکەن. لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا فێربوون کە چۆن لە ڕێگای دەستپێکی وتارێکەوە سەرنجی بەرامبەرەکەتان ڕابکێشن، ئێستا لە ڕێگای نموونەی ڕۆژانە و مێژووییەوە باسەکە قووڵتر و بەرینتر دەکەینەوە.

وتاربێژ ئەگەر بخوازێ دەرگایەك بەرەو ڕووی بیسەردا بکاتەوە، دەبێ

ئەو تێم و بابەتەی کە لە بارەیەوە قسە دەکات، بەشێوەی بنەڕەتی بزانێ و بەسەریدا زاڵ بێت. ئەو دەستپێکەی خوارەوە لە وتارێکی سیاسی وەرگیراوە کە باس لە "ئازادی بەکارهێنانی زۆر" وەك کەرەسەیەك لە سیاسەتدا دەکات، کە "پێترا کێلی" لە پەرلەمانی فیدراڵی ئەڵمان پێشکەشی کردووە. ئەم نووسراوەیە دەبێ ئەوەتان بۆ دەربخا، کە چۆن وتاربێژێك خاڵی سەرەکی دەپێکێ و بەکەڵك وەرگرتنی بەجێ لە مێژوو، باسەکەی بەرەو پێش دەبات. لە کۆتاییدا هەوڵ بدەن ئەم چەشنە گوتنە بەکاربێنن بۆ وتارەکەی خۆتان لەسەر وەرزش، هەڵبەت مەرج نییە کە جێگای میسالی مێژوویی بەمیسالێکی تازە نەگۆڕدرێتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ بیسەرانی بەشداردا پێك بێت.

## نموونە بۆ دەستپێکی وتارێك

پێترا کێلی، ئەندامی سەوزەکان لە باسەکانی ڕۆژی ٥ی مانگی مای ساڵی ١٩٨٣دا لە پەیوەندی لەگەڵ ڕاگەیاندنەکەی هێلموت کۆل ڕاوێژکاری ئەڵمانی لە پەرلەمانی فیدراڵی ئەڵماندا ئاوا دەڵێ:

"ئەوەی شتگەلێك ڕوو دەدن، ئەوە تەواوی ئەوە شتانە نین، کە ئێوە دەبێ ئاگاتان لێیان بێت. دۆستان! ڕۆزا لوگزمبورگ لە مانگی سپتامبری ١٩١٣ لە بەرنامەیەکی سیاسیدا دەڵێت:" ئەگەر دەیانەوێت ئێمە هان بدەن بۆ ئەوەی ئێمە ڕازی بین چەکی کوشتن دژی برایانی فەرانسەوی خۆمان بەکاربێنین، ئێمە هاوار دەکەین: نا، ئێمە کاری وا ناکەین." ئەم ئینساندۆستییەی ڕۆزا لوگزمبورگ لەم وڵاتەدا بە خیانەتی دەرهەق بە وڵات لە قەڵەم درا. وای کرد کە قازیەکان یەك ساڵ زیندانیان بەسەر ڕۆزا لوگزمبورگدا داسەپاند

## پرۆڤە بۆ دەستپێکردنی وتار

ئەگەر بخوازن دەستپێکێ بۆ وتارەکەتان لەسەر بابەتێك [تێم] بنووسن، لە لاپەڕەیەکی تری A٥کەڵك وەرگرن، کە ڕەنگی جیاواز بێ لە لاپەڕەی وشە گرینگەکانی بەشی سەرەکی وتارەکە. وا باشترە ڕستەی دەستپێکی وتارەکەتان وشە بەوشە دارێژن، و سەرەتا بەمێژوو دەست پێبکەن یان بەشتێکی تەواو ئاکتونێڵ [ڕۆژانەی گەرم] "دوێنێ بەیانی..." و "ئەمرۆ پاش نیوەڕۆ..." لە ڕێگای ئەم چەشنە دەستپێکردنەوەوە، ئامادەکارییەکی باشمان کردووە بۆ کاری دوایە و هەڵگەڕاندنەوەی وتارەکەتان لە کاتی پێشکەشکردندا. لێرەوە خراپ تێ نەگەین: دەستپێك تەنیا بۆ یارمەتی و ئەرخەیان بوون دەبێ بێتە سەر کاغەز.

لەبەرکردن [لە ڕوو نەخوێندنەوە] و زاڵبوون بەسەر بابەتەکەدا لە سەرەتادا ئاسان نییە و دەبێتە هۆی تووڕەیی و بێزاری. لەبەر ئەوەی بەهیچ شێوەیەك نابێ هەڵە لە دەستپێکدا هەبێ، تکایە چاوی پێدابخشێننەوە کە ئایا نموونەکەتان بێ هەڵە و لە جێی خۆیدایە . ئەگەر میسالەکەی ئێوە تەواو نەبێ، دەبێ دەستپێکی وتارەکەتان بگۆڕن. پاش ئەوەی ئەرخایەن بوون کە دەستپێکی وتارەکە تەواو بێ هەڵەیە، ئەوجا دەتوانن باوەڕ بەوە بکەن کە پاش دەستپێك بەشی سەرەکیی وتارەکە دەتوانێ کار بکاتە سەر بیسەر.

## تێپەڕبوون لە گەرما و یاو

بۆ وتاربێژ و وێژەرێك لە دەستپێك و دەرکەوتن گەرمتر و پڕیاوتر نییە. ئەگەر وێژەر و وتاربێژ خۆی بەتەواوی ئامادە کردبێ، پاش گوتنی چەند ڕستەیەك،دەچێتەوە دۆخی ئاسایی و یاو و گەرماکەی پاشەکشە دەکات. ئەم دڵە خورپە و دڵە ڕاوکێ چەند دەقیقەییە هەر ئەوەیە کە لە لای شانۆگەرێك لەکاتی دەرکەوتنە سەر سەکۆی شانۆ، پێك دێ، کە هەر بەو

چەشنە دەبێ بەسەریدا زاڵ ببن. پسیکۆلۆگە توندڕەوەکان پێیان وایە، کە ئەم حاڵەتە دەروونییە کە بۆ وێژەر و وتاربێژ دێتە پێش، دەبێ بۆ تێپەڕبوون بەسەریدا فێڵێك بەکار بهێندرێ، هەتا لەو حاڵەتی دەستپێکردنە دەرباز بین: لێ گەڕێن هەر لە سەرەتاوە قەڵەمێك بکەوێتە خوار و بەپەلە هەڵی گرنەوە.

ئەم جووڵانەوەیە کە هاوکاتە لەگەڵ هەناسەدان دەبێتە هۆی ئەوەی دڵەڕاوکێ و ترس لە ناو بەرێ و یارمەتی بدات بەوتاربێژ، بۆ زاڵ بوونی بەسەر دڵەڕاوکێی خۆیدا. "ئەم کارە لە لای بیسەر ون نابێ و وتاربێژ وەك کەسێکی بێ دەست و پێ نیشان دەدات ئەویش ڕاست لە دەستپێکی قسەکانیدا."

ئایا نابێ وتاربێژ، وێژەر بەجێگای ئەوە بیر لە فێڵ و تەڵەکە بکاتەوە، خۆی وا تەیار و ئامادە کردبێ و وا باوەڕی بەخۆی و بەقسەکانی هەبێ کە بتوانێ زاڵ بێت بەسەر گەرما و یاوی دەستپێکدا؟ لە حاڵەتێکی ئاوادا ئیتر وێژەر وەختی ئەوەی نییە بیر لە فێڵ و تەڵەکە بکاتەوە. بەڵام چۆن دەکرێ بەسەر گەرما و دڵەکوتەی خۆتان لەو حاڵەتەدا زاڵ بن؟ پێشتر دەبێ بگوترێ کە ئێوە پێوانەیەکی ساخ و سەلامەتتان هەیە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ حاڵەتی ئاوادا. بێگومان ئێوە ئاشنان لەگەڵ یاو و هەیەجانی سەفەرکردن. ئەوەش تەواو حاڵەتێکی ئاسایی و سروشتییە: مرۆڤ چاوەڕوانی نائارامی و ڕووداوی لەناکاوە. بەدڵخۆشی و [کەمێك ترسەوە] بڕۆن بەرەوپیری قسەکردن و پێشکەش کردنی وتارەکەتان.، لەبەر ئەوەی ئێوە باش خۆتان ئامادە کردووە، لاپەڕەی وشە گرینگەکان پشتیوانی ئێوەیە و هەروەها ئێوە زاڵن بەسەر دەستپێکی قسەکانتاندا.

ئەوەی چۆن وتاربێژێك بۆ یەکەم جار لە قسەکانیدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ دەکرێ لە قسەکانی ئێرنست هاکێل ڕوون بێتەوە، ناوبراو دەڵێ:

ترس و هەیەجان و خۆفێکی کە دوو مانگی تەواو هەتا ئەو سەعاتە لەگەڵ من دەژی، لە ڕاستیدا هیچ پێویست نەبوو. لە سەرەتا وا دەینواند کە هەر ئێستا قسە لە قوڕگمدا گیر دەکات و دەخنکێم، بەڵام کاتێك ئەو چەند ڕستەی سەرەتا کە باش [لەبەرم کردبوو] ئامادەم کردبوو لە دەمم هاتە دەرێ، بەشی دوایە زۆر ڕەوان و ئاسان بەدوایدا هات، و بەو جۆرە وتارەکەم تەواو پێشکەش کرد. منی نەزانن سەرەتا چووبووم، هەموویم نووسیبووەوە.

## کۆتایی وتارێك

ئەوەی کە تا ئێستا باس کراو و کاری لەسەر کرا، بەشەکانی سەرەکی و دەستپێك دەرباز بوون لە گەرما و یاو و هەیەجانی دەرکەوتن بوو. بەڵام چۆن دەکرێ، وتارێك بەکارتێکردنێکی زۆر لەسەر بیسەر کۆتایی پێ بێت. کورت تۆخۆلۆسکی دەزانێ چۆن هێڵی سوور بە ژێر وتارێکی خراپ و سەرنەکەوتوودا بکێشێ:

کۆتایی قسەکانت ڕابگەیەنە و پاشان نیو سەعاتی تر قسە بکە. مرۆڤ دەتوانێ چەند جارێك ئەمە دووبارە کاتەوە.

یەکێکی تر لە هەڵە گەورەکان کە بێگومان لای ئێوەش ئاشکرایە ئەو بەڵگەیەیە کە زۆر لە خوێندکارانی دەورەی وتاربێژی، قسەکانیان بەم ڕستە ئازیزە: ″ئەوە بوو قسەکانی من″ کۆتایی پێ دەهێنن، ئەوەش نیشانی بیسەری دەدات کە وتاربێژ لە کۆتایی قسەکانیدا زۆر ئەرخایەن نییە ئەوەش ڕەنگدانەوەی ئەو وێنەیە یەکە پێشتر لە پەیوەندی لەگەڵ بەشی دەستپێکدا باسمان کرد: من حەز دەکەم و دەمەوێ ئێوە...

بەپێی تاقیکردنەوەکان بۆ کۆتایی وتارێك، ئەم خاڵانە لە بەرچاو بگرن:

* کۆکردنەوە و گردکردنەوەیەك لە باسەکە، کە ڕوون و ئاشکرا بێت

* داخوازێك یان داوایەك كە بەباشی فورمولە كرابێت و داڕێژرابێ
* وتەیەك یان قسەیەكی نەستەق كە بەگشتی باوبێت
* وشەیەكی بیربزوێنەر، كە خەتێك بدات بۆ بەردەوام بوونی بیركردنەوە، و شتێك بداتە بیسەر بۆ وروژاندن و هاندانی.

## پەیداكردنی بیری كۆتایی

فۆرم پێ بەخشین بەكۆتاییی قسەكان گەرەكە تاك تاكی وشەكان بگرێتە خۆی، ئەم بەشەی كۆتاییی قسەكان لە سەر لاپەڕەیەكی تری A٥ لە ڕەنگێكی تردا بنووسن. لە كاتی كاركردن لەسەر ئەم بەشەدا، دەبێ ئەوەتان لە بیرنەچێ، كە بیسەر پاش بیستنی دوا قسەكانی ئێوە دەچێتەوە ماڵی خۆی و گەرەكە قسەكانی ئێوە لە لای بمێننەوە. گەلێك جار دەپرسن، كە ئایا ناكرێ كۆتاییی وتارێك سوك و ئاسان بەدێرێكی وا تەواو بكرێ: زۆر سوپاس بۆ ئێوە! ئەگەر پێتان وابێ كە وتارەكەتان هاندەری بیسەر بووە دەكرێ سوپاسی بیسەران بكەن بۆ گوێ گرتنیان. بەڵام ئەگەر پێتان وایە وتارەكەتان سوودمەند بووە بۆ بیسەران بەپێچەوانە ئەوان دەبێ سوپاسی ئێوە بكەن بۆ وێنە بەچەپڵە لێدان. كە وایە ئەگەر دەتانەوێ وتاربێژ و وێژەرێكی باش بن، كۆتایی قسەكانتان سەرێ و خوارێی نابێ پێ بكرێ و بەئامانجەوە كۆتایی پێ بێت.

## كۆتاییی وتارەكە

ڕاست لە كۆتاییی وتارەكەدا، هێندێك لە خوێندكارانی وێژەری دەردەچن. ئەوان دوا قسەی خۆیان تەواو كردووە و لەناكاو هەست بەناتەواوی دەكەن و لە ناو خەڵك دەردەچن. تۆنی دەنگی وێژەر دەری دەخات كە ئەو خۆی دۆڕاندوە، ڕاست لە كاتی فازی هاندانداكە بیسەر چاوەڕوانی دەكات. لێرەدا وێژەر ئیتر دەسەڵاتی بەسەر دەنگی خۆیدا نییە، بەڵكو دەنگی

لـە کـۆنـتـرۆڵـی خـۆدا نـامـێنـێ. ئـەگـەر ئـێوە لـە بـەشی پـێنـجـەمدا، بـەبـاشی پـرۆڤـەی [وتـاری] چـیرۆکـی وێنـەکـان، قـەل و گـۆزەڵـەی ئـاوتـان کـردبـێ، دەزانن کە چۆن لـە ڕێگای دەنگەوە هـەڵسوکەوت لەگەڵ دوا ڕستەی وتارێك دەکـەن. ئـەوە بـکـەنـە مـەبـەستـی خـۆتـان کـە دوا ڕستـەکـانـی وتـارەکـەتـان بـەدەنـگـێکـی بـەهـێز هـەتـا کـۆتـایـی پـێش ببـەن و بـەپـێی بـابـەت و تـێمـی وتارەکە، بەرزی کەنەوە. دەنگ هـەر وەك دەزانن لـە فۆڕمی کەوانیدا بەرەو خوار دەکشێ، بیسەر تەنیا ئاوا تێ دەگات کە وتارەکە بەرەو کۆتایی قسەکان مل دەنێ.

وانەی ٦

## لە تۆنی تاکەوە هەتا دینامیك

*ئەوەی بیری لێ دەکەیەوە و دەیڵێی، بەر لە هەموو شت، تەنیا دەربڕینە. ئەوەی ناو و مانای لەسەر دادەندرێ، تەنیا مانای دەربڕینەکە نییە.*

[کریستیان مۆرگن شتێرن]

بێگومان بۆتان هاتووەتە پێش کە هەست بەبێگانە بوون بکەن، کاتێك بۆ جاری یەکەم گوێتان لە دەنگی تۆمارکراوی خۆتان دەبێ، دەنگی خۆتان نەناسیوەتەوە. بەڵام ئەگەر بەردەوام دەنگی خۆتان تۆمار کردبێ و گوێتان بۆ ڕاگرتبێت بۆتان دەردەکەوێ و هەست بەوە دەکەن: تاکە تۆنی دەنگتان ڕوون نییە و خۆتان لە دەنگی خۆتان ناگەن.

زۆرجار وێژەری تازەکار هەوڵ دەدا تۆنی تاکە وشەکان دەرخات، بەڵام دەکەوێتە باری هەڵەوە و یەکدەستیی قسەکردنی خۆی دەردەخات. لای دەرەوەی [ئاکسێنت]ی تاکە وشەکان دەنوێنێ، هەر وەك چۆن لە میسالی مۆسیقادا دەردەکەوێت.

تەکنیکی تەواو و کەماڵی وەستایانە هەیە، کە هەموو زەرافەتەکانی دەرەوە نیشان دەدات و سەرئەنجام بەشێوەی ئۆتۆمات دەردەکەوێ. ئەمە گەمە و کایەی سازکراو نییە و بیسەر سارد و سڕ دەکاتەوە و هاتنی تۆن بەدوای تۆن دایە.

بەڵام بەپێچەوانەوە دەرخستنی ڕاستەقینەی لێکدانەوەکان، گۆڕینی گەمە نییە و کایەکردنی تێدا نییە، بەڵکو لە ناو و ناخی دەروونی ژیانەوە سەرچاوە دەگرێ و خۆی دەردەکەوێت.

ئەگەر بێتو تۆن لە پەیوەندی لەگەڵ [ڕێتۆریك]دا بەکاربهێندرێ، ئەم

پرسیارە دێتە پێش: ئایا وتاربێژ دەتوانێ دینامیك و هەروەها تەكنیكی جیاكردنەوە، بەرزی و نزمی فێربێت و لە هەمان كاتدا دووركەوێتەوە لە تۆن و شێمای ڕواڵەتی دەرەوە؟

## پێكهاتەی تێكست

تێكستێكی "نیگۆن گۆمرینگر" گەرەكە یارمەتی ئێوە بدات بۆ تێگەیشتن و زاڵبوون بەسەر ئەم بەشەدا. تكایە ئەم شیعرە بخوێنەوە و لە پێشدا سەرنج بدە سەر لایەنی دەرەوەی شیعرەكە، بزانە چ كارتێكردنێكی لەسەر تۆیە.

### تێكستی وێنەیی

| | | |
|---|---|---|
| بێدەنگ | بێدەنگ | بێدەنگ |
| بێدەنگ | بێدەنگ | بێدەنگ |
| بێدەنگ | بێدەنگ | بێدەنگ |
| بێدەنگ | بێدەنگ | بێدەنگ |
| بێدەنگ | بێدەنگ | بێدەنگ |

ڕەنگە یەكەم كاردانەوەی ئێوە لە دیتنی ڕواڵەتی دەرەوەی ئەو تێكستە، ئەوە بێ كە هەست بەبێگانەیی و نامۆیی بكەن، سەرتان سووڕدەمێنێ و بیردەكەنەوە.

بۆچی شاعیر كارێكی تری نەكردووە، جگە لە ماوەی ١٤ جار تاقە وشەی بێدەنگ بڵێتەوە؟

لاپەڕەیەكی سپی $A^4$ بگرە دەست و بەپانایییەوە دای بنێ، هەوڵ بدە لە كاتی نووسینەوەدا، تایبەتمەندییەكانی ئەو تێكستە پەیدا بكەی. ئەم تێكستە بگوێزەوە، ناوەڕاستی لاپەڕەكە و هەوڵ بدە دەروونی ئەم تێكستە وەربگری.

ڕوون بوونەوە

ڕەنگە بەخوێندنەوەی ئەو تێکستە ئەم شتانەی خوارەوەت پەیدا کردبێ

* سەرجەمی ڕستەکە ونە و تەنیا یەك وشەی "بێدەنگی" بەردەوام دوبارە دەبێتەوە.
* مانای وشەی بێدەنگ وەك ناو
* وشەکان بێ ئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ یەك دیار بیت، هەروەها بێ دانانی نیشانەگەلی لە یەك جیاکردنەوە، لە پاڵ یەکدا داندراون.
* وا دەردەکەوێ کە لە پاڵ یەك دانانی وشەکان بەو چەشنە بە مەبەستێکی فکری نەبێ
* ڕواڵەتی دەرەوەی تێکستەکە ئاوایە کە وشەکان لە ڕووی نەزمێکەوە بەشێوەی گرووپ گرووپ لە ژوورێکی چۆڵدا چندراون.

بەپێی ئەم بۆچوونە، مرۆڤ ناتوانێ مانای ناوەرۆك لە تێکستەکەدا دەربخات، بەڵکو تەنیا لە ڕێگای بینینەوە لە سەرەتا لەڕووی ڕواڵەتەوە لە ڕووی دەرەوە کار دەکاتە سەر بینەر. چاوەکانی خوێنەر بەدیتنی وشەی بێدەنگ لە ژوورێکی چۆڵدا مۆڵەق دەوەستن. ئەدی شاعیر بەڕیز کردنی ئەم وشانە بەم چەشنە چی دەردەبڕێ؟ بۆ وشەیەکی تری هەڵنەبژاردووە؟ ئایا وشەی بێ دەنگ مانای یەکسانی هەیە؟

## تێگەیشتن لە ناوەرۆکی تێکست

ئێستا بچنە ناو قولایی تێکستەکەوە. میتاسیۆن بۆ وتاربێژ یاریدەدەرێکی زۆر گرینگە، کە لەو ڕێگایەوە دەتوانێ خۆی بۆ قسەکردن ئامادە بکات. نە هەر کەسێك سەردەکەوێ، ئەم کارە ئەنجام بدات، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ فێربێ، بۆ ئەوە لەسەر سەکۆی شانۆ بەسەرخۆیدا زاڵ بێ؟.

ئەگەر ئێوە لە دەوروبەری خۆتان هێمنی و ئارامشتان نییە، ئەم پرۆڤە

بگوێزنەوە بۆ کاتێکی دی، کە بتوانن باشتر کۆنسنتراسیۆنتان هەبێت.

بەقووڵی بگەڕێنەوە بۆ بیرەوەرییەکانتان و هەوڵ بدەن هۆی ئەوە پەیدا بکەن کە بۆ مرۆڤەکان بۆخۆیان بێدەنگی هەڵدەبژێرن و یان چی لە دەرەوە ئەوان هان دەدا بێدەنگ بن. بیر لە ڕووداوەکانی ڕابردووی میللەتی ئەڵمانیش بکەنەوە، کە ئێوە ڕاستە و ڕاست تێیدا بەشدار نەبوون. ئێوە هێدی هێدی دەگەنە ئەو شوێنە لە تێکستەکە لە ناوەڕاستی لاپەڕەکە تەواو وستکوتی لە ناو زمانی شیعرەکەدا زاڵە و دەگەنە مەتەڵی ناو شیعرەکە.

لە ڕێگای چوونە ناو بیرەوەرییەکانی خۆتان و وەبیرهاتنەوەی زۆر شت ڕەنگە کۆمەڵێك وشەی سەرەکی و گرینگ بەزەینتاندا هاتبێت وەکو: ترس، ڕیسك کردن، بێ هیوایی، بێ ورەیی، ڕاچەنین، خەمساردی، شین، بێ دەستەڵاتی، دژ ڕاوەستان، وەلانان، شۆڕش و هەڵتۆقین.

ئێستا تێ بکۆشە، تێکستەکە بخوێنییەوە و خۆتی لێ نزیك کەوە. ئەگەر بەتەنیا پڕۆڤە دەکەی هەموو ١٤ وشەکە بخوێنەوە و بەتاڵ بوونی ناوەڕاستی شیعرەکەش لە بەرچاو بگرە. ئەگەر بەیەکەوە لەگەڵ هاوکارەکەتان و یان لە گرووپێکدا کار دەکەن تکایە هەر کەسە و یەك دێر بەشوێن یەکدا بخوێنێتەوە. ئێوە دەبێ هەر دێرێکی تێکستەکە بەپێی ئەو خشتەیە بخوێنەوە.

| | A | B | شێوەی خوێندنەوە |
|---|---|---|---|
| دێری ١ | شۆڕش | فەرمان | زۆر بەهێز |
| دێری ٢ | خەمساردی | ڕیسك کردن | مام ناوەندی |
| دێری ٣ | ڕیسك کردن | بێ هیوایی | نزم |
| دێری ٤ | ترس | بێ دەستەڵات | مام ناوەندی |
| دێری ٥ | دژایەتیکردن | وەلانان | زۆر بەهێز |

لێرەدا بەپێی ئەو میسالەی کە بۆ ئیمکان و شێوەی خوێندنەوە پێشنیار کراوە، دێڕی یەك و دێڕی پێنج، زۆر بەهێزەوە دەخوێندرێنەوە، کە لەگەڵ نـاوەرۆکـی وشەکـان ڕێکـە و یـەك دەگـرنـەوە. هـەر بـۆیـە گـەورەتـریـن دینامیکتان لە خۆتان نیشان دا، هەر وەك چۆن لە مۆسیقادا Fortissimo پلەی بەهێزی دەنگە. لە دێری سێیەمدا، لەگەڵ تۆنی نزم ڕووبەڕووین و دارشتنی قسەکان لە ناوەڕاستی شیعرەکەدا بەشێوەیەکە کە ئێمە زمانی قسەکردن بەکارناهێنین بەڵکو کات لێرەدا تەرخان کراوە بۆ بیرکردنەوە. واتە شیعر، کەلام، پاشان بیرکردنەوە و بەپێچەوانەی دێری یەك و پێنج دارشتنی بێدەنگی لێرە خۆی لە بێدەنگی تەواودا دەردەخات، نە زمانی و کەلامی، بەڵکو دەنگ نامێنێ و جێگا دەدرێ بەبیرکردنەوە. پاشان لە دێڕی چواردە، دیسان ساخ کردنەوەی دینامیك و بەهێز بوون دەبیندرێ هەتا ئەوەی دیسان بەبەرزترین تۆن و دینامیك دەگات.

## قسەکردنی دینامیك

ئێستا تێکستی شیعرەکە بەمەیل و ئارەزووی خۆت بخوێنەوە و بەڵام لە کـاتـی خـوێـنـدنـەوەیـدا، دەنـگـی کـۆتـایـیـی وشەی بێدەنگ قـووت مـەدە و بەڕوونی و بە ئاشکرا دەریی بخە. بۆ قسەکردن و خوێندنەوەی تێکستەکە هەستە سەر پێ بەو جۆرە هێز و توانی زۆرتر لە دەنگدا هەیە. ئەگەر باوەڕ دەکەی کە توانیوتە ناوەرۆکی تاك تاکی وشە لە ڕێگای دینامیك بوونی خـوێـنـدنـەوەدا بـاشـتـر دەربـخـەی، دەبـێ ئـەوە بـبـێـتـە عـادەت لـە کـاتـی خـوێـندنـەوەی وتـار و شیـعـر خـوێـندنـەوە بـەشێوەی ئـازاد. بـەڵام تـوانـایـی خۆتان زۆرتر و زۆرتر و زۆرتر تاقی بکەنەوە، هەتا تەواو تەواو لە خۆتان ڕازی دەبن.

## گۆڕینی وتارێکی ئامادەکراو

خوێندنەوەی وتارێك بۆ کەسێك تازە کارە، وەك مۆتەکە وایە. بەڵام لە هەر حاڵدا باوەڕ بەو پڕۆڤانە بکەن کە تا ئێستا ئەنجامتان داوە، لەبەر ئەوەی بەو تەجروبانە کە لە پرۆسەیەکدا وەدەستیان دێنن دەگەنە ئەو لێهاتوویيەی کە وتاربێژێکی باش بۆ قسەکردن هەیەتی.

زۆرجار وا هەیە چەند وتاربێژ لە سیمینارێکدا لەسەر یەك تێم و بابەت قسە دەکەن. چی بەئێوە دەگات ئەگەر ببینن وتاربێژی پێش ئێوە هەمان بیر و فکری ئێوەی لە وتارەکەیدا هێناوە و پێشکەشی خەڵکی دەکات. چ حاڵ و وەزعێکی شەرماوی دەبێ ئەگەر مرۆڤ وتارەکەی وا پێشکەش بکات کە ئامادەی کردووە کە ئەوەش دەبێتە دووبارەکردنەوە و کاوێژی هەمان شتی گوتراو لە لایەن وتاربێژی پێشترەوە، بەو حاڵە ناوی ئێوە لە لیستی وتاربێژەکان دایە و بانگ دەکرێن بۆ پێشکەش کردنی وتارەکەتان.

## وێنە وتار و وتاربێژی پێشتر

لە بارەی باس لەسەر بەرفراوان کردنەوەی مەیدانی ژیانی مریشکەکان لە ناو قەفەسەکاندا وتاربێژی پێش ئێوە ئەو بەشەی کە ئێوەش لە وتارەکەتاندا قەبوڵتان کردووە لە تێکستی خوارەوەدا هێناویەتی:

«خانم و ئاغایانی بەڕێز، بەرفراوان کردنەوەی مەیدانی ژیانی مریشکەکان لە ناو قەفەسەکاندا سەردەمانێکی زۆر درێژە باسی لێوە دەکرێ، یانی لەو دەمەوە کە لایەنگرانی مافی ئاژەڵان داوای باشترکردنی ژیانی ئەوان دەکەن. تا ئێستا تەنیا ٥٠٠ سانتی مەتری چوارگۆشە بۆ قەفەسی مریشکان تەرخان کرابوو. ئەوەی کە ١٠٪، مەیدانی ژیانی مریشکەکان لە ناو قەفەسدا زیاد کراوە جێگای دڵ خۆشییە. حزبەکەی ئێمە داوا دەکات کە بەلانی کەمەوە، دەبێ مەیدانی شوێنی ژیانی هەر

مریشکێك کەمتر لە ٧٠٠ سانتی مەتری چوارگۆشە نەبێت. تکایە ئەوەتان لە بەرچاو بێت لە کاتی دەنگ داندا».

ئێوە وەك قسەکەری پاش ئەم وتاربێژە هەست دەکەن، ناتوانن شتێکی تازەتر لەوەی کە وتاربێژی پێشوو، لەسەر ئەم بابەتە باسی کرد باس بکەن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دێنە سەر باسەکە: «خانم و ئاغایانی بەڕێز، بەچڕ و پڕی وتاربێژی پێش من باسی بابەتەکەی کرد و من تەنیا دەمەوێ لە گۆشە نیگایەکی دیکەوە باسی لێ بکەم

یەکەم دێر بۆ بیسەر بانگەوازکردنی ئەوەیە کە وێژەر قوفلی کردووە بەتایبەت ئەوە بەهێزتر دەکات لە ڕێگای ڕستەی دەستپێکەوە... بەچڕ و پڕی...و ڕەنگە ئەمە بێتە هۆی یەکەم باوێشك لە لەیەن بیسەرەوە. ڕەنگە بەشێوە گوتنی یەك هارمۆنیی ئەم ڕستانە ئەوەندی دی بیسەر بێواز بکا و وەك خواردنی حەبی خەو کار بکاتە سەر بیسەر.

## بەهێزکردن

هەوڵ بدەن ئەم حاڵ و هەوایەی باس کرا، بەشێوەیەك بگۆڕن، بۆ ئەوە بەچەشنێکی دی قسەکان دەست پێ بکەن، بەوجۆرە کە سادە و ئاسان ئەوە دووپات مەکەنەوە کە وتاربێژی پێش ئێوە چی وتووە، بەڵکو ناوەڕۆك بەهێزتر بکەن. بێگومان لە بیرتان نەچووەتەوە کە قسەکەری پێش ئێوە باسی چ خاڵگەلێکی کردووە کە بەتەواوەتی نەچۆتە قووڵایی مەسەلەکە و لێکی نەداوەتەوە. بەپێی ئەم بۆچوونەی کە ئێستا بیرتان لێ کردووەتەوە وتارێکی نوێ ئامادە بکەن، لە پێشدا وەك پرۆڤە ئەم وتارە نوێیە لەسەر کاغەز بنووسنەوە.

بە وشەی توند و تیژییەوە ناڕازی بوونی خۆتان دەربڕن لەسەر ئەو قسانەی کە تا ئێستا لەسەر ئەم بابەتە باس کراوە، بۆ ئەوەش چەند نموویەك ئاڕاستە بکەن. لێگەڕێن با لە نووسراوەکەتاندا وشەگەلێکی

کەمتر گرینگ و پاشان وشە گەلێکی زۆرتر گرینگتر و پڕ ماناتر لە ڕستەکەتاندا بەکاربێت بۆ ئەوە بەگۆڕینی ئەم وشانە قسەکانتان سەر و خواری تێدا دروست بێ و تۆنی دەنگ بەرز و نزم بێتەوە و دینامیك لە ڕستەکان و قسەکاندا جێ بگرێ.

## پێش خستن و بەرجەستەکردن

زۆر یارمەتیی ئێوە دەدات، ئەگەر شوێنە گرینگەکانی ناو وتارەکە دەتانەوێ بەرجەستەی بکەنەوە، بەڕەوان نووسی (سۆفت)ی ڕەنگی دەنیشانەی بکەن، بۆ ئەوە لە کاتی خوێندنەوەدا لە بەرچاوی بگرن. لە کۆتاییدا وتارەکەتان لە بەرامبەر هاوکارەکەتان یان گرووپەکە پێشکەش بکەن. پاش بیستنی ڕەخنەکانی هاوکارەکەتان یان ئەندامانی گرووپەکە دەور و ڕۆڵەکە دەگۆڕنەوە و تۆ دەبی بەبیسەری وتەکانی هاوکارەکەت.

پاش تەواوبوونی پرۆڤەکەتان، ئێستا سەرنج بدەنە ئەو وتارە کە لە پەرلەمانی ئەڵمان لە ٢٤ی مانگی یونی ساڵی ١٩٨٢دا پێشکەش کراوە.

## نیازی مەیدانی ژیان بۆ مریشکان

١ خانم و ئاغایانی بەڕێز، وتاربیژی بەر لە من هەوڵیدا ڕوونی کاتەوە کە گەورە کردنەوەی ژینگەی مریشکەکان بۆ ١٠٪ جێگای ڕازیبوون نییە و کیفایەت ناکات. ئەو پێشنیاری کرد بەرینی شوێنی ژیانی مریشکەکان نەتەنیا ٥٥٠ بەڵکو ٧٠٠ سانتی مەتری چوارگۆشە زۆرتر بکرێ.

٥ بەڵام خانم و ئاغایانی بەڕێز، من پێموایە، ئەگەر بۆ یەك جاریش بێت دەبێ بەڕوونی بگوترێ– کە لێرە چاوپۆشی لێکراو نەهاتە زمان، ئەویش ئەوەیە کە لێرە باس و گفتوگۆ لەسەر شت نییە، بەڵکو باس لە سەر پەلەوەرێکە، باس لەسەر گیانداریکە. بەڵێ، باس لەسەر

گیانلەبەرێك! پێداویستی بەپەلە و خێرای گەورە کردنەوەی ژینگەی ئەوانە بو ١٠٪ نەهاتە سەر زمان.

١٠ خانم و ئاغایانی زۆر بەڕیز! هێندێك خۆتان بخەنە زەحمەتەوە، و بیهێنە بەر نەزەری خۆتان کە مافی هەر کام لە ئیوە بۆ ماڵ و ژینگە لە بەرامبەر قەفەسی مریشکاندا چەندەیە. مریشکێك لە قەفەسێکی ٥٥٠ سانتی مەتری چوارگۆشەدا ئەوەندەی جێگا نییە باڵی فش کاتەوە و دەورێك خۆی بسووڕێنێ. ئێوە دەبێ جارێك بچن و بەچاوی خۆتان ئەو مریشکانە ببینن.

١٥ ئەوانە زیندەوەری بێ زمانی بێ گلەیین کە لە لایەن ئێمەوە دەچەوسێنرێنەوە، بۆ ئەوەی ئێمەی ئینسان بەیانان هێلکەی هەرزان بێتە سەر مێزی بەرچاییمان. ئەگەر ئێوە ناتانەوێ ئەو بەستەزمانانە مۆری شتیان لێدەن و بەگیانلەبەریان دادەنین – مەبەستم لە ڕوانگەی ئایینی مەسیحەوەیە – کە وایە ناتوانن خۆتان بەوە ڕازی بکەن کە ئەو مریشکانە تەنیا ٥٥٠ سانتی مەتری چوارگۆشەیان بۆ ژیان پێ ببەخشرێ.

٢٠ هەر بۆیە خانم و ئاغایانی بەڕێز، بەهەموو هێزەوە بانگەواز دەکەم بۆ ویژدانی ئێوە. کەوایە ئەگەر ئەم مەخلووقانە ئیزنیان نییە ئازاد بژین بەلانی کەمەوە ٧٠٠ سانتی مەتری چوارگۆشەیان بۆ ژیان بۆ تەرخان بکەن و دەنگی لەسەر بدەن، ئەوەش کەمی کەمەکەیەتی کە مریشکێك بتوانێ تێیدا بژی.

### چۆنییەتیی کارەکە

پاش ئەوەی تێکستی ڕێگا چارەت خوێندەوە، تکایە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە.

* لە کوێ لە ناو تێکستەکەدا ڕستەی ڕەنگ کراوە، بەرچاوە، کە بۆ بیسەر

دووبارەکردنەوەی فیکرەکەیە؟

* لە کوێ بەرجەستە کردنەوەی بیر و فکری ناو تێکستەکە دەبینن، کە سەربەخۆ دەنوێنێ؟

ئەو شوێنانە لە ناو تێکستەکەدا بەقەڵەمی ڕەنگی [ڕەنگی جیا] دیاری بکەن.

وەڵامی پرسیارەکان: لە دێری ٧ و ١٧ بەشی ڕەنگ کراو دەبیندرێ. لە دێری ٦ و ١٨ بەرجەستەکردنی بیر و فکر دەبیندرێ.

جارێکی دی کار لەسەر تێکستەکەی خۆتان بکەنەوە بەرجەستەکردنی تێدا بەکاربێنن. بۆ ئەوە بتوانن قسەکانتان کۆنترۆڵ بکەن، قسەکان تۆمار بکەن.

پاشان هاوکارەکەتان وتارەکەی خۆی لەسەر ئەو تێمە واتە مەیدانی مریشکان لە نێو قەفەسدا پێشکەش دەکات و دەبێ لە ڕێگای دینامیکی دەنگیەوە قسەکانی بەهێزتر بکات.

## بەرین کردنەوەی زمان

"زمان لە کاتی منداڵیدا پێك دێت، پشکوێ"، ئەم ڕستەیە وای دەردەخات کە پێش بەفێربوون بگرێ. ئەوەی ئایا زمان لەسەردەمی منداڵیدا پەرە دەستێنێ و یان زیانی پێ دەگات، شتێکە کە گەورەکان پاشان هەستی پێ دەکەن، ئەو کاتەی ئەم سەروەتەیان لە دەست دابێت یان نا. گەورەکانیش دەتوانن مەیدانی ئەکتیڤی زمانی خۆیان بەرفراوانتر کەنەوە. زمان بەو مانایە کە نەتەنیا بیستن و نووسین نییە بەڵکو زمانێك کە قسەی پێ بکرێ و بەکاربهێندرێ. مرۆڤ نابێ چاوەڕوانی ئەوە بێت گەورە ساڵێك بەچەند هەفتە زمانەکەی لە هەموو لایەنێکەوە بەرینتر بێتەوە و پێش بکەوێ، کارێك کە بۆ منداڵێك بەساڵان کاتی بۆ دادەنێت. کە وا بیرکەینەوە دووچاری هەڵە دەبین. ئەوەی هەموو تواناکانی زمان بەکاربهێندرێ بۆ قسەکەر و وتاربێژێك گەلێك گرینگ و پڕ مانایە. بۆ ئەوەی پرۆڤە لەسەر

بـەریـن کـردنـەوەی زمـان بـکـرێ لـە کـاتـی کـارکـردن لـە مـاڵێدا گوێ لـە بـەرنـامـەی ڕادیـۆیـی بگـرن، بـۆ وێنـە بـەرنـامـەی وتـووێـژ یـان لـێکدانـەوە، دیالۆگ لە نێوان چەند کەسدا یا باس و قسەکانی ناو پەرلەمان.

* ئـەو وشە و قسانـە کـە پـێتـان وایـە بـەکـەڵکتـان دێن بـۆ قسەکردنێکی ئـەکتیڤ، لـە دەرفـەتێکدا یـاداشتیـان بـکـەن و بـیـاننووسن. نـاوەرۆکی قسەکانیش لە بەرچاو بگرن و لە دیداری داهاتوودا بۆ هاوکارەکەتان و یان کەسانی دی بگێڕنەوە و ئەو شتانە کە بۆ ئێوە جێی سەرنج بووە باسی بکەن.
* ئەو وشە و دەستەواژانەی کە دەتانەوێ لە قسەکانتاندا بەکاریان بهێنن و بە زمانەکەی خۆتانی زیاد بکەن بیاننووسنەوە.

**نموونە**

نموونەیەك کە تاقیکردنەوەی نووسەری ئەم کتێبەیە لەم دوو هەنگاوەی خـوارەوەدا خـۆی دەنـوێنـێ و دەتـوانـێ یـارمـەتـیـدەر بـێت. بـۆ کـورسێك [ڕیتۆریك] کە زۆربە لە کەسانی لاو و ژنانی ناوماڵ و کارمەندان پێك هـاتـبـوو، دوکـتـورێکیش نـاوی خـۆی نـووسیـبـوو کـە بـەپـێی پـیشـەکـەی و دەرەجـەی زانـیـنـی و تـاقـیـکـردنـەوەی ژیـانـی، خـۆی لـە وانـی دی زۆرتـر هـەڵـدەکـێشا. لـیـێ پـرسرا کـە ئـایـا نـایـەوێ کۆرسەکە بگۆڕێ و بـچێتـە کورسێکی دی، وەڵامی داوە نا، پێکهاتەی گرووپەکە بۆ ئەو ئەسڵ نییە و بڕیاری داوە هەتا کۆتایی لەگەڵ ئەو گرووپەدا بمێنێتەوە. وشەی ئەسڵی لە قسەکانیدا بەکارهێنا و هەوڵی نەدا تەئسیر و کارتێکردنی ئەم وشەیە بەر تەسك کاتەوە. ئەم کەسە لای خۆی گەیشتە ئەم قەناعەتە کەچی ئەسڵە و چی بۆ ئەو لە پلە دووەم دایە. گفتوگۆکەم حەواڵەی کەسێکی تر کرد. وشەکـانـی ئـەسڵ و پـلـە دووەم، دەبـوو لـە قسەکـانـی بـەشدارانـی تریشدا بەکاربێت.

**بەکارهێنان**

ئەم باسەی کارکردن بەم دوو وشەی ئەسل و پلە دووەم بەکاربێنن بۆ گفتوگۆ لە نێوان خۆت و هاوکارەکەتدا و یا لە ناو گروپەکەدا. لەگەڵ ئەوە ئەو وشانە کە پێتان خۆشە وەك وشەی ئاکتیڤ کەڵکی لێ وەرگرن بەکاری بهێنن. نموونەکەی ئێمە لێرە دەست پێ دەکات:

من گەلێك جار بیرم لەوە کردوەتەوە کەچی لە ژیانمدا بۆ من گرینگە و چی بۆ من ئەسل و سەرەکییە. زۆر خەڵك پێیان وایە خاوەنی مادیات بوون ئەسڵە. ئایا تۆش هەر وا بیردەکەیەوە، چی بۆ تۆ لە ژیانتدا ئەسڵ و شتی سەرەکی و پێوانەیە؟

تۆ و هاوکارەکەت هەردووکتان پرسیار لە یەکتر بکەن و دوو وشەی ئەسڵ و پلە دووەمی تێدا بەکاربێنن، بەچەشنێك بتوانن لەو ڕێگایەوە وشەگەلی نەزۆك و پاسیوی خۆتان وەك وشەی چالاك و ئاکتیڤ بەکاربهێنن. ئێوە خۆتان دەتوانن بیسەلمێنن کە چەندە ئاسانە، چالاکانە گوێ گرتن و کارکردن،

* وشە وەرگرتن و ڕاگرتن
* وشە وەرگرتن و ڕاگرتن
* وشە بەکارهێنان

لای خۆتان دەستەیەك کارت سازکەن بۆ ئەو وشانەی کە بۆ ئێوە نائاشنان. هەر وشەیەکی تازە لەسەر یەك لەو کارتانە بنووسن، لە پشتی کارتەکە ڕوونکردنەوە لەسەر وشەکە و نموونەیەك بنووسن.

* هەموو ئەو وشانە کە ئێستا ئێوە بەباشی نایناسن، لەسەرە سەرەوە دایانبنێن. بەمجۆرە کە لەگەڵ وشەکە ئاشنا بوون کارتەکە بخەنە ژێرەوە.

وانەی ٧

## دەربڕین لە زمان و جووڵەدا

یەکگرتن و ئاوێتە بوونی جووڵە و زمان، ئەمڕۆ مانایەکی زۆری بۆ وتاربێژ و وێژەر هەیە و هەروەها گرفتێکی زۆر گەورەشە، هەر وەك چۆن ٢٠٠٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆش، ئەو گیروگرفتە هەبووە، کاتێك نووسەر Cicero سیسیرۆ، بەناوبانگترین کتێبی خۆی De oratore, ئۆڕاتۆرە لەسەر وێژەر و وتاربێژ دەنووسی.

پێویستە بگوترێ کە گیروگرفتەکان زۆرتر بوون، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە ڕێگای پێشکەوتنی شارستانییەت و تەکنیکەوە بەشێکی زۆر لە جووڵە سروشتییەکانی خۆی لە دەست داوە. بێگومان تەکنیك دەوری گرینگی لە ژیانی مرۆڤی ئەمڕۆدا هەیە، بەڵام بەشی زۆری جووڵەی مرۆڤ دەگرێ و بەرەو هەژاریی جووڵە و جووڵەی یەك لایەنەی دەبات. لە ڕێگای دەست دانانی لەسەر دوگمە یەك، ماشێنەکان دەست بەکار دەکەن. تەلەفزیۆن بەشیوەیەکی دی کاری کردووەتە سەر مرۆڤ: ئینسان بەدانیشتن لەبەر شاشەی تەلەفزیۆن، خۆی دەگۆڕێ و پێی وایە ئەگەر سەیری بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی کرد ئەوە ئەویش جووڵاوەتەوە و وەرزشی کردووە، لەم ڕێگایەوە بینەری بەرنامەی وەرزشی دەست دەکات بەخۆفریودان.

ئەگەر بمانەوێ بەتەواوی پەرە بەجووڵانەوەی لەش بدەین، دەبێ بجووڵێینەوە و تەمرین بکەین. خەڵکی وڵاتانی شەرقی ئاساییتر و سروشتیتر گەورە دەبن، منداڵ لە کات و زەمانێکدا و لە تەمەنێکدا شارەزای هارمۆنیی مۆسیقا دەبێ کە هاوکاتە لەگەڵ فێربوونی هارمۆنیی جووڵە و حەرەکەت کردن.

هەڵپەرکێی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، چێژێکی پڕجۆشە، کە سێ یان چوار بەرە [نەوە] بەیەکەوە هەڵدەپەڕن و مرۆڤ لە دوور دوورەوە گوێی لە

ڕیتمێك دەبێت كە ئینسان دەخاتە جۆش. بەڵام ئەگەر كەسێك بەشداری لە كۆڕی هەڵپەڕكێدا نەكات ئەوە دادەنیشێ و بەچەپڵەلێدان لەسەر ڕیتمێك بەشداری دەكات. كاتێك هەوای مۆسیقا دەگۆڕدرێ و مۆسیقای نوێ دەست پێ دەكات یەكێك لە بەساڵاچووەكان هەڵدەستێ و دەست بەچەپڵەلێدان دەكات كە ئەوە تەواوی خەڵكەكە وەجۆش دەخات، بۆ هەڵپەڕكێ و جووڵانەوە.

بۆ ئەوەی ئێوە ئاشنا بن، كە چۆن زمانی نیشانەكان لە هەموو لەشدا دەردەكەوێ، دەبێ ڕیتمی چەپڵەلێدان پڕۆڤە بكەن، لەبەر ئەوەی تەنیا كاتێك ئێوە دەتوانن زمانی نیشانەكان لە هەموو لەشدا ببینن كە جووڵانەوەی لەش ڕەوان و بێ گرێ، ئەنجام بدرێ، لەو حاڵەدا زمانی نیشانەكان لە لەشدا ئازاد و بەرەڵا دەكرێ و دەبێتە پشتیوان بۆ قسەكردن و وتاربێژی.

## جووڵانەوە لەگەڵ مۆسیقا

ڕەنگە مۆسیقایەكی فۆلكلۆریتان بەشێوەی كاسێت، قەوان و یا سی دی هەبێت، كە بتوانن بەكاری بێنن بۆ كەڵك وەرگرتن لە تاكتەكانی. ئەم مۆسیقایە دەبێ مۆسیقای هەڵپەڕكێ بێت، پڕ لە جۆش و جووڵانەوە بێت، بۆ ئەوەی ئێوە بتوانن بكەنەوە ناو ڕیتمە زیندووەكەوە.

### واریاسیۆنی ١

لەگەڵ تاكتی مۆسیقاكە، بەتەنیا یا لەگەڵ هاوكارەكەتان یا لە گرووپەكەدا چەپڵە لێ بدن. وەك خەڵكانی سروشتی چەپ بتەقنن: بە لەشێكی پڕ جۆش و قۆڵ و باسكی شل. گەیشتن بەم شل بوونە، بی ئەوەی خۆت چیڕبكەیەوە، كارێكی ئاسان نییە. بەشی سەرەوەی باسك نابێ وا بنوێنێ كە لكاوە بەلەشەوە. وای دابنێن كە ئێوە بەرەو ڕووی كەسێك دەچن و دەتانەوێ چاك و خۆشی لەگەڵ ئەو كەسە بكەن و دەستی خۆتان درێژ

دەکەن بۆ ئەوە دەستی لەگەڵ لێ دەنەوە. هەر بەو ئەندازەیە دەبێ دەستەکان کاتی چەپڵەلێدان لە لەشی مرۆڤەوە دوور بێت. ئەنیشکی هەر دووك دەست و لاولاوەکانی هەر دووك دەستیش دەبێت شل بن. بەم شێوەیە تێ بکۆشن هەڵپەڕکێیەکی پڕ هێز و پڕ جۆش بگێڕن و لە هەمان کاتدا هەر دووك لەپی دەست لە پێکداداندا شەقەیان دێت.

## واریاسۆنی ٢

نزم، بەڵام تیژ و قایم، لە حاڵەتی دووەمدا دەبێ چەپ بتەقنن. ئەمە بەشێوەیەك دەبێت کە سەرقامکەکانی یەك لە دەستەکان لە ناوەوەی لەپی دەستەکەی دی، دەدرێ. دیسان هەر دوو باسك لێرەش دوور لە لەش جێ دەگرن و لە پێشەوە ڕاست دەکرێنەوە. هەردووك بەشی سەرەوەی باسك نابێ وا بنوێنێ کە لکاوەتەوە بەلەشەوە، سەرجەم لەش دەبێ شل بێت.

## واریاسۆنی ٣

بۆ ئەوەی ئێوە بتوانن هەر دووك باسکتان ڕەهاکەن، پێویستە ئەم تەکنیکە کە ئێستا فێری بوون بێ مۆسیقا بەکاری بێنن، بۆ ئەوە بەرزی و نزمیی چەپڵە لێدان بەیەکەوە گرێ بدرێن. بۆ ئەوەش دەبێ بەباسکەکانتان بازنە [دایرە]یەك بکێشنەوە کە لە خوارەوە بۆ سەرێ دەچێ. لە کاتێکدا کە هەر دووك دەستتان لە ڕێکی نێوکتاندا بێت بەسەری قامکەکانی دەستێك بکێشن بەلەپی دەستەکەی دیکەدا، هەڵبەتە دیسان دەستەکانتان دەبێ دوور لە لەشتان بن. لە کاتی پڕۆڤە کردن و کێشانی بازنە [دایرە]، بەردەوام دەبێ چەپڵە لێ بدەن، کاتێك دەست لە سەرەوە جێی گرتووە، دوو لەپی دەست لێك دەدرێن و کاتێك لە خوارێ بێت سەری قامکەکانی دەستێك لە ناوەوەی لەپی دەستەکەی دی دەدرێ. لە کاتی دەنگی بەرزدا کە لە سەرەوە لێ دەدرێ دەبێت دەست بەسەر سەردا هاتوچۆ بکات.

**واریاسۆنی ٤**

ئەگەر تا ئێرە بەباشی فێربوون، بەشی کۆتایی ئەوەیە کە هەموو لەش بکەوێتە جووڵانەوە. بۆ جووڵانەوەی هەموو لەش دەبی گەڕان بەپێی سووڕانی عەقرەبەکانی سەعات بێ. هەر بۆیە لە پێشدا دەبێت لە حاڵەتی بنەماییدا ڕاوەستن و پاشان قورسایی لەش گەرەکە بکەوێتە سەر قاچی چەپ. قورسایی لەش هەر لەسەر ئەو پێیە دەمێنێتەوە و ئێستا پێی ڕاست هەڵدەگیرێ و تەنیا سەر پەنجەکان عەرزی دەماڵێ.

وەك لە وێنەکەدا بەرچاوە، دیسان هەنگاوەکان دەگەڕێنەوە بۆ حاڵەتی بنەڕەتیی ڕاوەستان، پاشان قورسایی لەش دەکەوێتە سەر لاقی ڕاست و دیسان دەگەڕێتەوە بۆ حالەتی بنەڕەتی. ئەمە بەردەوام دووبارە کەنەوە، چەپڵە لێدانتان لە بیرنەچێ.




## زمانی لەش

پاش ئەنجامدانی ئەم پرۆڤانە، ئەگەر هەست بەوە بکەن کە لەشتان ئاکتیڤ بەڵام چیرە، کەوایە ئامادەیە بۆ ئەنجامدانی پرۆڤەی ″زمانی نیشانەکان″.

یەکەم تەمرین دەبێ نووسینی کار و ئیشی ساکار و ئاسان بێت بەوشە. بۆ ئەوە دەبێ گرینگترین بەش بەباشی تێ بگەیەندرێ یا بۆ بردنە سەرێی تێگەیشتن دەبێ لە زمانی لەش کەڵك وەرگیرێ. لە هیچ کاتێکدا بەهیچ چەشنێ نابێ "نیشانەکانی زمانی لەش" جێگای وشەکان بگرنەوە و وشەکان لە گوتندا ون بن و جێگایان چۆڵ بمێنێتەوە. "نیشانەکانی زمانی لەش"، بۆ تەواو کردن و کامیل کردنی وشە و زمانیش نییە.

ژیانی هوندووری و دەروونی و ئامادەکاریی ڕۆحی، پێداویستیی سەرەکین بۆ وتاربێژ و وێژەر، ئەگەر بیانەوێ، زمانی لەش بەجێ بۆ ئامانجی خۆیان بەکار بهێنن. بۆ ئەوەی نیشانەکانی زمانی لەش لە دەم و کاتی پێویستدا بنوێندرێن، دەبێ دەستەکان، ناو بەناو لە حاڵەتی شلی و خاویدا، لە حاڵەتی دەستپێکدا جێ بگرن. [سەیری بەشی یەك بکە" ئازاد قسەکردن]. دەستەکان دایم دەبێ شل و ئازاد لە پاڵ لەش هەڵکەوتبێن، هەرچەند ئەو کارە ڕەنگە بۆ قسەکەرێکی تازەکاری لەش چیر گران و چەتوون بێت. ئەم پرۆڤانە نابێ وەك پانتۆمیم سەیر بکرێ، کە لە ڕێگای بێ دەنگی دەربڕینی لەشەوە ئەنجام دەدرێ و هونەرێکی ترە. کام لەو ناوەڕۆکانەی خوارەوە زۆرتر لە ئێوە نزیکە؟

**تێم / بابەت**

| | |
|---|---|
| گۆڕینی تەگەری ماشێن | ڕاخستنی سفرە لەسەر مێزی میوانیدا |
| پەنچەرکردنی تیوپی پاسکیل | سازکردنی کێك بۆ جەژنی لە دایکبوون |
| هەڵکردنی کوورە | ئامادەکردنی سالاد |
| بەفیرۆنەدانی کات لە سڕینی شووشەی پەنجەرەدا | چۆنیەتیی تەڕ و وشك کردنی منداڵ |

لەسەر هەر کام لەم بابەتانە ڕستەیەکی دەستپێك لە پێشدا بنووسن و پاشان بەهێنانەوەی نموونەیەك لە ڕوداوێك کە بۆ ئێوە ئاشنایە، کێش بدەنە قسەکان. وشەی ناو وتارەکە نابێ لە ڕێگای نیشانەکانی زمانی لەشەوە فەرامۆش بکرێ، بەڵکو دەبێ هاوڕێ بێت لەگەڵ نیشانەی زمانی لەش. دەبێ هاوکارەکەتان کاتی بینینی نیشانەکانی زمانی لەشی ئێوە، بیروڕای خۆی بنووسێ و پاشان لەگەڵ ئێوە باسی بکات.

## سەرنجدان لەسەر "نیشانەکانی زمانی لەش"

ڕەنگە "نیشانەکانی زمانی لەشی" ئێوە لەگەڵ ڕیتمی تەمرینەکان وابووبێت کە هاوکارەکەتان ڕای باشی لە سەر دابێت. بەو حاڵە بەشێوەی گشتی دوو خاڵ بۆ پێشبردنی "نیشانەکانی زمانی لەش".

* نیشانەکانی زمانی لەش، ڕاست و لە جێگای خۆیان دان، ئەگەر جووڵانەوەیان لە خزمەتی وشە گوتراوەکاندا بێ و مانای وشەکان ڕوونتر بکەنەوە، ئێوە دەتوانن بەپێی ناوەرۆکی وتارەکە ئارام و هێدی، زیندوو و یا پڕجۆش بن.

نیشانەکانی زمانی لەش هەڵەن، ئەگەر جووڵانەوەکان لاڕێ بووبن، ئەرخایەن نەبوون دەربخەن، ویا نیشانەکان جێگای وشەکان بگرنەوە و یا نیشانەکان لە نێوان وشەکاندا و لە کاتی پشووی ناو وشەکان نیشان درابێ. لاڕێ بوون و خزینی نیشانەکان لە لای تازەکاران ئاوا دەردەکەوێ: کە نیشانەکان و زمان هارمۆنییان لەگەڵ یەکدا نەبێ و بەیەکەوە نەلکابن.

## پڕۆڤەی نیشانەکانی زمانی لەش

بۆ ئەوەی وتارەکەتان، بەڕاستی دوور لە هەڵخلیسکانی نیشانەکانی زمانی لەش بێت، کورتە چیرۆکێك بگێڕنەوە، کە سێ وشەی سەرەکی تێدا

بـەکـار هـاتـبـێت: پـەنـچـەربـوونـی تـەگـەری مـاشێن/ هـەوای خـراپ/ شەوە زەنگ. بـێگـومـان دەتـوانن خـۆتـان لـە وەزعێکی وادا ببـیـنـنـەوە، تـەنـیـا لـە وەزعێکی وادا ڕەنگدانەوەیەکی زیندووی ڕووداوەکە ئیمکانی هەیە. بیر لە دەستپێکێکی پڕ لە کێش بکەنەوە. پـاش ئـامـادەکارییەکان یـەکسەر دەست پێ بکەن و هـانی بیسەر یان هـاوکارەکەتان بدەن.

ئێستا دەورەکەتان لەگەڵ هـاوکارەکەتان بگۆڕنـەوە، لێ گەڕێن بـا ئـەویش چیرۆکـەکـەی خـۆی وێڕای نیشانـەکـانـی زمـانـی لـەش، بـگێڕێتـەوە. ڕەنگە هـاوکارەکەتان لـە پـەیوەندی لـەگەڵ چیرۆکی پەنچەربوونی تەگەرەکەدا، واریـانـتـێکـی سەرکـەوتـوو بـگـێڕێتـەوە. سەرنـج بـدەنـە سەر وتـارەکـەی هـاوکارەکەتان بزانن قسەکانی دوور دەبێ لە جووڵەی زیادی و کۆنترۆڵ نەکراو و بێ سوود.

## دەرکەوتنی "نیشانەکانی زمانی لەش"

ئـایـا دەتـانەوێ لە کاتی پێشکەشکردنی وتار و لە کاتی وێژەریدا، زمـانی وشە و زمـانی لـەشی ئێوە بەتەواوی لەگەڵ یەك ڕێك بێتەوە؟ لە چیرۆکی "ئـەستـێرە..."دا فـێر دەبن کـە چۆن "نیشانـەکـانـی زمـانـی لـەش" تـاك تـاك بـەکاربهێنن.

هـەروەك چۆن لە هـەموو تەمرینەکان لە پێوەندی لـەگەڵ "نیشانـەکانی زمـانی لـەش"دا بـاسکرا، ئێوە وەك وتـاربێژ نـابێ لە چوارچێوەیەکدا قەتیس بمێننەوە. بەڵکو دەبێ لە پێوەندی لەگەڵ وتارەکەتاندا خۆتـان ئـازاد ببینن. ڕەنگە ئێوە ئەو چیرۆکە بناسن و لە کاتی منداڵیدا بیستبێتتان. لێرە ئێمە تـەنـیـا لـەگـەڵ مـادە و شتـێك ڕووبـەڕوو نـابـین، کـە پێوەندی بـەمـرۆڤی فـرەزانـەوە نـەبێ. لێرە بـاس لـە منداڵێکە، کـە ئـاخـرین کراسەکەی خۆی دەبەخشێ. لە جیاتی ئەو کارە باشەی کە کردوویەتی وەك خەڵات، کراسی خۆی دەبەخشێ. لە بری ئەو کارە باشەی کە کردوویەتی، کراسێکی تازەی

زۆر جوانتری خەڵات دەکرێت. زیادە لەوە زێڕێکی زۆری لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێ کە بەشی تەواوی عومری بکات. ئایا هەر مرۆڤێکی عاقڵ بەوە پێناکەنێ؟ کێ ئامادە دەبێ هەموو شتێکی خۆی پێشکەش بکات و چاوەڕوانی موعجیزەیەك بێت؟

### تەکلیف لە بارەی تێکستەکەوە

ئیزن مەدەن ڕواڵەتی دەرەوەی چیرۆکەکە واتان لێ بکات کە بەقووڵی نەچنە ناو ناوەڕۆکەکەیەوە. ڕەخنە گرانە سەیری تێکستەکە بکەن و هەوڵ بدەن بۆچوونی خۆتان لەسەر بایەخەکانی چیرۆکەکە دەربڕن. ئایا پەیامی ئەو حەکایەتە بایەخی گێڕانەوەی هەیە، یان ناوەڕۆکێکی وا دەبێ لە دنیای مودێرنی ئەمڕۆدا لە بیربچێ؟

### ئەستێرە...

جارێکیان کەنیشکێکی بچکۆلانە هەبوو، کە دایك و باوکی نەمابوون، بەتەنیا دەژیا. ئەو، هێندە هەژار بوو، تەنانەت ژوورێکی بچکۆلانەشی نەبوو تێیدا بژی، نۆن و بانێکی نەبوو، شەوانە تییدا بخەوێ، ئەو کچۆڵەیە جگە لەو جلوبەرگەی کە لەبەری دابوو و کوتە نانێك کە بەدەستییەوە بوو، هەر هیچ شتێکی نەبوو، کە ئەویش کەسێکی دڵ پڕ بەزەیی پێی بەخشیبوو. ئەو کەنیشکە کەسێکی باش و پارێزگار بوو. لەبەر ئەوەی تەواو لە دنیا دابڕابوو. ئەو بەرەو چۆڵگەیەك وەرێ کەوت و دڵخۆشیی ئەوەبوو کە: ″کە خوای میهرەبان یارمەتیی دەدات.″

لەم ڕێگایەدا تووشی پیاوێکی هەژار هات و ئەم پیاوە پێ گوت: «ئاخ، شتێکم بدەیە بۆ خواردن، زۆرم برسیە». کەنیشکەکە هەموو نانەکەی دا بەکابرای هەژار و گوتی:

«خودا ئاگادارت بێ!» و پاشان بەردەوام درێژەی بەڕێگای خۆی دا.

دوورەوە کچۆڵەیەك دەهات و دەینالاند و دەیگوت: «سەرما کەللەی سەرمی تەزاندووە، شتێکم پێ ببەخشە، بۆ ئەوەی سەرمی پێ داپۆشم!» کەنیشکەکە کلاوەکەی خۆی پێ بەخشێ. ماوەیەکی دی ڕۆیشت، دیسان تووشی منداڵێك بوو کە ڕووپۆش نەبوو لە بەریا و لە سەرمان هەڵدەلەرزی. کەنیشکەکە ڕووپۆشەکەی خۆی. بە منداڵەکە بەخشی. لەسەر ڕێگا ،چاوی بەمنداڵێکی ڕووتی سەرمابردوی دیکە کەوت، منداڵەکە داوای کراسە داوێن قوڵەکەی بەری لێ کرد. کەنیشکەکە کراسە داوێن قوڵەکەشی دا بەو منداڵە. سەرئەنجام کەنیشکەکە گەیشتە ناو لێرەوار [جەنگەڵ]ێك، شەو بەسەردا هاتبوو و هەموو دنیا تاریك بوو. لێرەش تووشی منداڵێك هات و لەبەری پاڕاوە کە کراسەکەی بەو ببەخشێ. کەنیشکی پارێزگار بیری کردەوە، هەموو دنیا تاریکە، و کەس تۆ نابینێ، تۆ دەتوانی کراسەکەت ببەخشی، کراسەکەی لەبەری داکەند و بەخشیی. هەر بەوجۆرە کە وەستا بوو و هیچی لە بەردانەبوو، لە ناکاو ئەستێرە لە ئاسمانەوە بەسەریدا بارین، کە پارەی بریقەدار و زرینگەدار بوون. هەر دوای ئەوەی کراسەکەی خۆی بەخشی لە جیاتیان کراسێکی تازەی جوانی زەریفی هاتە بەری. دوایی دەستی کرد بەکۆکردنەوەی پارەکە و بۆخۆی بۆهەتاهەتایە دەوڵەمەند بوو.

## ڕوونکردنەوە

سالانی زوو خەڵك کەڵکیان لە زمانێکی پڕ لە وێنە وەردەگرت کە لە حەکایەتە کۆنەکاندا کارێکی ئاسایی و گشتی بوو. ئەمڕۆ تێکستێکی پڕ لە وێنەی لەو چەشنە، تەنیا لە کاتێکی تایبەتدا دەنووسرێ. تێکستەکە وشە بەوشە دادەڕێژرێ کە هەربۆیە تێگەیشتن لە تێکستی وا دژوار دەبێ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئیتر عادەتی بەتێکستی وا نییە، کە زمانی وێنەی تێدا

بەکارهاتبێت.

وای دابنێ: مەبەستی ئەم حەکایەتە ئەوەیە کە زمان وەك وێنەکێشان بنوێنێ. بۆ گەیشتن بەو مەبەستە پێویست بەوە دەکات شتەکانی ناو حەکایەتەکە وەك نان، کڵاو، کراسی قوڵەو، کراس بنوێندرێن. بەڵام شتەکانی تر "ئابستراکتن" وەك خۆشەویستی، شادی، شانس، تێگەیشتن کە هەمووی ئەوانە ئەو کەنیشکە هەیەتی کە بەردەوام لە قالبی جلوبەرگ و نان پێشکەشیان دەکات کە ئەویش بۆنیشاندانی هاودەردیی ڕوودەدا و خۆی لە خۆشەویستی بەرامبەرەکەدا دەبینێتەوە کە لە حەکایەتەکە وەردەگیرێ، کە وەك نان و جلوبەرگ باسی لێوە ناکرێ.

ئەگەر مانا و مەفهوومی زمانی وێنە کە گەیاندنی بایخەکانە بۆ بیسەر دەربکەوێ، کەوایە حەکایەتی ئەستێرەیەکان لەناکاو نیشانی بیسەر دەدا کە ئەو حەکایەتە ڕوویەکی تریشی هەیە، کە تازە ئەلێرەوە بیسەر لە ڕێگای زمان و نیشانەکانی زمانی لەشەوە، دەتوانێ تێگەیشتنی تایبەت بە خۆی، وەك بیسەرێك لە حەکایەتەکە هەبێ.

پاش ئەوەی دەرکەوێت کە تێمەکە بۆ ئێوە تێمێکی ڕۆژانەی زیندووە، ئەوجا دەتوانن خۆتان لە ناوەرۆکی قسەکان نزیك بزانن، کە ئەوە شەرتێکە بۆ ئەوەی ئێوە، ئەو تێمە لە ڕێگای زمان و نیشانەکانی زمانەوە وەك وتار دەرببڕن.

## پرۆڤە

ئەم پرۆڤەی خوارەوە "نیشانەکانی زمانی لەش"، ڕاست و هەڵە نیشانی ئێوە دەدات. بۆ ئەوە هەرکەس بەپێی ویست و خواستی خۆی حەکایەتی "پوڵەکانی ئەستێرەدار" بەکاردەهێنێ، نابێ لە پێشدا بچنە سەر ئەو ڕێگا چارەی خوارەوە، بەڵکو دەبێ هەرکام لە ئێوە دارشتنی تایبەتی خۆتان پەیدا بکەن، بۆ ئەوە دواتر بتوانن ئازادانە کار بکەن و دارشتنی تایبەتی

خۆتان بەکاربێنن.

لە ناو تێکستی حەکایەتی پوڵەکانی ئەستێرەداردا، بگەڕێن ئەو جێگایانە کە پێتان وایە زۆر باشە بۆ ئەنجامدانی نیشانەکانی زمانی لەش لە ڕێگای دەست و باسکەوە، ژێرەکەی خەت بکێشن. هەرکەس ئەو جێگایانە نیشانە دەکات کە لای گرینگ دەنوێنن. هەر بۆیە نابێ لاتان سەیر بێت کە هاوکارەکەتان یان کەسێك لە گرووپەکەدا ئەو جێگایانەی دەست نیشان کردوون کە بۆ ئێوە گرینگ نەبوون، گرینگ ئەوەیە ئێوە وەك خۆتان چ شوێنێکتان پێ گرینگە.

## ئیمکانێك بۆ ڕێگا چارە

بیر لەوە بکەنەوە کە چۆن دەتوانن ئەو جووڵانە بنوێنن، بۆ ئەوەش نۆت هەڵگرن و ویستەکەتان بنووسنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا مۆدێلی جووڵەکە بکێشنەوە. نووسینەوەی نیشانەکانی زمانی لەش، تەنیا وەك نموونە چاو لێ بکەن. ئێوە بەتەواوی ئازادن کە چۆن و چ جووڵەیەك بەکاربهێنن.

* هەموو جووڵەکان وەك زمانی گێڕانەوە زمانی گوتن بەڕێوەدەبردرێ. جووڵەکان دەقاودەق دەبێ گێڕانەوەکە بگرێتەوە.

دێڕی ١، کەنیشکێکی بچکۆلانە: لە پێشدا هەردووك باسك شۆڕ بوونەتەوە. باسکی ڕاست هێدی هێدی بەجووڵەیەکی بێدەنگ و نەرم، گەورەیی کەنیشکەکە دەنوێنێ. پاشان باسك هێدی و بێ دەنگ دەگەڕێتەوە شوێنی پێشووی خۆی.

دێڕی ٢، هێندە هەژار بوو: هەر دوو دەست لە حاڵەتی ئارامی خۆیان دێنە دەر و بەرەو پێشەوە دەکێشرێن. کردنەوەی هەر دوو دەست لە سەرێ و دەرکەوتنی دوو پەنجەی هەر دووك دەست هەژاری کەنیشکەکە دەنوێنن.

دێڕی ٤، جل و بەرگەکەی کە لەبەرییدا بوو: هەر دووك دەست کە لە

بەرزاییی سنگدا هەڵکەوتن، دەکێشرێنە خوارەوە هەتا دیسان شۆڕ دەبنەوە جێگای خۆیان.

دێڕی ٤، کوتە نانێك بەدەستەوە: دەستی ڕاست کە لە حاڵەتێکی نیوە بەستراودایە دەکێشرێتە پێشەوە بۆ نواندنی کوتە نانەکە.

دێڕی ٧، بەرەو چۆڵگەیەك: لە ئەنیشك بۆ خوارێی دەستی ڕاست، بۆ لای ڕاست دەکێشرێ. کە بۆ ئەوە باسکی ڕاست بەتەواوی دەکێشرێتەوە، بۆ ئەوە بتوانێ دووری چۆڵگە کە بنوێنێ.

دێڕی ١١، هەموو نانەکە دەدا بەکابرا: دەستی وا ڕاست دەکرێتەوە کە وا دەنوێنێ کە نانەکە دەبەخشێ. جووڵەکە نابێ تەنیا بەدەست کۆتایی بێ، بەڵکە هەموو لەش بەشدارە لە جووڵەکەدا.

دێڕی ١٦، کڵاوەکەی خۆی پێ بەخشی: هەر دووك دەست لە تەنیشتەوە بۆ لای سەر دەچن و بەنەرمی دەگەنە سەر و بەنەرمی وا دەنوێنن کە کڵاوەکە دەبەخشرێ.

دێڕی ٧١، ڕووپۆشی نەبوو لەبەریا: هەر دووك دەست لە تەنیشتەوە دەکێشرێن بەلەشیدا. جووڵە لە بەرزایی شانەوە دەست پێ دەکات.

دێڕی ٢٨، لەناکاو ئەستێرە لە ئاسمانەوە بەسەریدا بارین: بەرزترین بەشی حەکایەتەکە، کە دواترین ڕستەیە، کە بەهێزترین جووڵەش بەخۆیەوە دەبینێ، ئێرەیە. بەکێشترین جووڵە لە نێوان وشەکانی لەناکاو و بارینـدا بەکاربێنن، بەچەشنێك لەم کاتەدا هەر دووك دەست زۆر بەئارامی هەتا ئەو جێگایە کە دەکرێ بەرەو سەرەوە دەکێشرێن. هەر دووك دەست تەواو دەکێشرێنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ حالەتی دەستپێك. ئەم جووڵەیەی کۆتایی بۆ وێژەر و وتاربێژی تازەکار گران دەنوێنێ و دەبێ زۆر کاری لەسەر بکرێ. بێ حەوسەلە بوونی تازەکار، گران دەنوێنێ و دەبێ زۆر کاری بۆ بکرێ. بێواز بوونی تازەکار، بۆ ئەنجامی ئەم جووڵەیە

خۆی لە کۆم کردنی ئەنیشك بۆ خوارێ و تەواو بەکارنەهێنانی ئەنیشك بۆ سەرێ و تەواو بەکارنەهێنانی هەر دووك دەست بۆ ڕاست کردنەوەیان دەردەکەوێ. هەڵبەت ئەوە لە کاتێکدایە کە ئێوەش ئەم بەشە وەك بەرزترین شوێنی چیرۆکەکە ببینن. کە ئەوەش بەوە وەگرێ دراوە کە چۆن هەرکە سێك مامەڵە لەگەڵ بەکارهێنانی زۆری و کەمیی "نیشانەکانی زمانی لەش"دا دەکات بۆ مانا بەخشین بەبەرزترین و گرینگترین شوێنی چیرۆکەکە. هەڵبەت ئەم کارە نابێ وا گەورە بکرێتەوە و وا نیشان بدرێ کە زیادە لە ئەندازە بێت و زیان بەچیرۆکەکە و ناوەرۆکەکەی بگەیەنێت.

## دوورکەوتنەوە لە گەورەکردنەوەی نابەجێ

لە ناو تێکستەکەدا شوێنی وا هەیە کە بۆ نیشانەکانی زمانی لەش، دەست نادا. جووڵانەوەی هەڵەو زیادی، پێکەنین هێنەر، دێنە بەرچاو. لەم بارەوە لە ناو تێکستەکەدا ئەو شوێنانە پەیدا بکەن و بیروبۆچوونی خۆتانی لە بارەوە بڵێن.

باشتروایە ئەو شوێنانە کە دەست نادەن بۆ جووڵانەوەی دەست و باسك و لەش بەڕەنگی سوور دیاری بکردرێن، ئەو شوێنانە دەبێ بێ تۆن بهێڵدرێنەوە.

### ئەو "نیشانانەی زمانی لەش" کە هەڵەن

هێندێك جار نیشانەکانی زمانی لەش لەڕادەبەدەر زل دەکرێنەوە و زەق دێنە بەرچاو یان لە خۆڕاوە بەکاردەهێندرێن و زیادین. لەو تێکستەی خوارەوەدا دەبێت لە هەر حاڵدا لە بەکارهێنانی ئەو چەشنە نیشانانەی زمانی لەش دووری بکەن:

دێری ٦، دڵ پڕ بەزەیی: دەستی ڕاست ڕادەکێشرێ بۆ لای مەمکی لای چەپ و لەسەر دڵ دادەنرێ.

دێری ٦، باش و پارێزگار: دوو دەست بەرزکردنەوە شێوەی دوعاکردن.

دێری ٢٠، ڕووتی سەرمابردوو: هەر دوو دەست لەسەر سینگ دانان و خۆ ڕاوەشاندن.

دێری ٢٠، داوای کراسە قوڵەکەی بەری لێ کرد: هەوڵدان بۆ پیشاندانی کراسی منداڵان لە ڕێگای کێشانەوەی جلوبەرگەوە.

دێری ٢٦، کراسەکەی داکەند و بەخشیی: دەستەکان وا دەنوێنن کە کراسەکە بەسەر سەریدا دادەکەندرێ.

وشەکان دەبێ حاڵ و وەزعێکی ڕاستەوخۆ دەربخەن یان زەمینەکەی دیارتر بدرکێنن.

نیشانەکانی زمانی لەش، تەنیا بۆ ڕوونتر دەرخستنی ماناکانە. ئەگەر وشەیەکی گوتراو بۆ خۆی بەچەشنی ڕێئال کیفایەت دەکات، ئیدی پێویست ناکات شتی لێ زیاد بکرێ.

* بەکارهێنانی ئەو پرۆڤانەی کە ئەنجامتان داون دەبێ هێندە بەسەر لەشی خۆتاندا زاڵ بن کە بتوانن حەکایەتی ئەستێرە بگێڕنەوە و زمان و نیشانەکانی زمانی لەش، بەباشی لە پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا بەکاربێنن. بۆ ئەوەی لە ناو تێکستە نووسراوەکەدا خۆتان قەتیس نەکەن، ئەم دەستپێکەی خوارەوە بەکاربێنن:

ئێوە حەکایەتەکە ئازاد و بەبێ کەڵك وەرگرتن لە نووسراوە دەگێڕنەوە. وردەکارییەکان و ڕووداوەکان کە لە چیرۆکەکەدا بەشوێن یەکتردا هاتوون، دەکرێ بگۆڕدرێن، بەو مەرجەی مەنتیقی حەکایەتەکە تێك نەچێ.

ئێوە بۆخۆتان دەتوانن بڕیار بدەن کە کەنیشەکەکە لەپێشدا کڵاوەکەی ببەخشێ یان کراسە قوڵەکە و یان بەپێچەوانە. ئەوەش دەکەوێتە سەر زەوق و توانای هونەریی خۆتان کە لە کوێ نیشانەکانی زمانی لەش

بـەکـاربـێنـن یـان بـەکـاریـان نـەهـێنـن. جوولـەکـانـی لـەش زۆر هـێدی و لەسەرەخۆ بەکاربێنن و هەتا کۆتاییی چیرۆکەکە بەردەوام بن و وەك ئەو هونەرمەندە کار بکەن کە پەڕەمووچی نەقاشی بەدەستەوە دەگرێ و هێدی ڕەنگ بەسەر تابلۆی نەقاشیدا دەکێشێ، نابێ لە پڕێکدا لە ناو قسەکان و جوولەکانی لەشدا پچڕان ڕووبدات. ئەگەر ئەو پرۆسەیە لەناکاو کۆتاییی پێ بێ، نەشیاوی لەو وێنەیەدا بەدی دێنێ کە ئێوە خەریکن نەقاشیی دەکەن. بۆ پرۆسەی وتاربێژی، هاوڕێیی و هاوئاهەنگیی زمان و زمانی لەشیش وایە و هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی دەبێ ئەم پرۆسەیە بەدی بکرێ. تێکستی وا هەیە کە بەپێی ناوەرۆکی وتارەکە، وتاربێژ دەبێ بەهێزتر و بەپەلەتر و وشکتر لەشی بجوولێنێ، کە لە هەر حاڵدا دەبێ لەگەڵ ناوەرۆکی بابەتەکەدا ڕێك بێتەوە.

ئێستا خۆتان ئامادەکەن و وەرنە پێش و دەست بکەن بەگێڕانەوەی حەکایەتەکە و جوولەی پێویست بەکاربهێنن.

* بۆ ئەوەی نیشانەکانی زمانی لەش، خاوەنی هارمۆنی بن و هەموو کەس هەست بەو هارمۆنییە بکات، پێویستە بەردەوام تەمرین بکردرێ و زانیاری لەسەر ئەم هونەرە وەربگیرێ. بیر لەوە بکەنەوە کە شانۆگێڕێك پاش چەند ساڵ کار و تەمرین و خۆ ڕاهێنان دەبێ بەشانۆگێڕ. چ ڕێگایەك هەیە بۆ ئەوەی ئێمە مانای دەربڕین و پێداویستییەکانی دەربڕینی زمانی لەش، ڕوون و ئاشکرا بکەین؟

بەپێی فەرهەنگی خەڵکانی سروشت ئاسا، زمانی لەش لە لای ئەوان ئیلیمێنتێك [تۆخم]ێکی تێگەیشتن و ڕووبەڕوو بوونەوەی کۆمەڵایەتییە. ئێمە یەك بوونێك دەبینین، کە نیشاندەری هارمۆنیی نێوان تەواوی لەش و جوولەکانی لەشە لە پەیوەندی لەگەڵ قسەکردندا. ماکس فریشی شاعیر پێی وایە لە هەمان پەیوەندیدا، ئێمەی [ئاڵمانی] [هەڵدەچین]، ئەگەر باس

لە بەرپرسیارەتیی زمانی لەش بکرێ. ئەو پێی وایە ئەوە ئەو شتەیە کە لێرە ئێمە لێمان ون بووە. گەورەکان بۆخۆیان دادەنیشن، قاچەکانیان درێژ دەکەن، هێندێك سیغار دەکێشن، لە تەنیشتیان هێندێك خانم هەیە، کە ئیتر ڕەنگی قاوەیی پێستیان وەك خۆی نەماوە، بەڵام دیسان لە ڕێگای پلاستیکی دەموچاویانەوە دەناسرێنەوە، هەروەها لە ڕێگای ددانەکانیانەوە، یا لە ڕێگای خۆ کز کردنێکی لە ڕادەبەدەر، لە هەمووی زیاتر لە ڕێگای جووڵەکانی وێنەی گیانلەبەرانەوە دەناسرێنەوە، کە دەست ناجووڵێتەوەهەتا هەموو باسك ڕەوان لەگەڵی نەجووڵێتەوە، هەروەها هیچ کات سەر ناسووڕێ، مەگەر پشتیش لەگەڵی بسووڕی کە شانەکانیش لەگەڵی دەسووڕێن، ئەوەش هێدی هێدی یان بەپەلە ئەنجام دەدرێ. هەمووی ئەو جووڵانەش خۆڕسك و نائاگا ئەنجام دەدرێن، بێ ئەوەی بەشێکی تری لەش دووچاری چیری بێت، لەش و جووڵەکانی ڕەوان بەپێی ڕیتمێك ئەنجام دەدرێ و ئەو جووڵانەش یەکتر دەگرنەوە لە جێی خۆیاندا بەکاردەهێندرێن.

وانەی ٨

## میمیك، نیشانەكانی زمانی لەش و تێمپۆ

كاتێكی زۆرم پێویست بوو بۆ ئەوەی تێ بگەم چۆن نێوچاوان، چاوەكان، برژۆڵەكان، برۆ، گلێنەی چاو، لێوەكان، كەنارەكانی زار، چەنە [چەناگە]، پشتی سەر، پشتی مل و باسكەكان، قاچەكان [لاقەكان]، جومگەكانی دەست، ئەنگوستەكان [قامك]، ستوونی مۆرەكان، مل، قژی سەر، لەش، سمت بەكاربهێنم، بۆ ئەوە پەیوەندی لەگەڵ خەڵكدا پێك بێ، ئەو كارەی كە پاشان بۆ جاری یەكەم لە چارلی چاپلینم بینی... [فریتس كۆرتنێر]

هەر بەشدارێكی مەدرەسەی وتاربێژی دەیەوێ هەرچی زووتر میمیك و نیشانەكانی زمانی لەش و كایەكردن بەزمانی ئیشارە و سیما (دەموچاو) فێربێت. سروشتییە كە ئەو كەسانە هێندێك جووڵەی دەست و لەشیان پرۆڤە كردبێ. بەڵام ئەم كارە كەمتر پەیوەندیی بەنیشانەكانی زمانی لەشەوە هەیە كە ڕەنگدانەوەی نواندیی دروونی مرۆڤەوە بێت.سەرچاوەی میمیك و نیشانەكانی زمانی لەش لە دەروون و لەناوەوەی ئینساندا هەڵكەوتوون و لێوەوە هەڵدەقوڵێن و دەگەنە هاودەنگ و هاوقسەی هەركام لە ئێمە، لێرەدا مەبەست ئەوە نییە ئێوە وتارێك بخوێننەوە و یا پێشكەشی بكەن، مەبەست گەیاندنە، مەبەست نێونجی كردنە لە نێوان ئەو دەروونە و كەسی بەرامبەردا، لێرە مەبەست بەرپاكردنی شۆ و نمایشدان نییە.

كاری چارلی چاپلینیش ئەنجامدانی شۆ نییە. هونەرەكەی ئەو بۆ گەیاندن و پێوەندی كردن بوو. زاڵبوون بەسەر ئەم هونەرەدا لە ڕێگای سەرنجدانی پڕوچڕ سەری گرتووە، هەر وەك چۆن لە قسەكانی [فریتس كۆرتنێر] لە بارەی هونەری چارلیندا دەردەكەوێ كە لە سەرەتای قسەكەیدا [فریتس كۆرتنێر] دەڵێ: «كاتێكی زۆر پێویست بوو هەتا تێ بگەم».

ئـەوە قسەی کـەسێکـە کـە وەك شانـۆگـێڕ و دەرهـێنـەر لـەگـەڵ مـیـمـیك و نیشانەکانی زمانی لەش و نواندنی زماندا سەروکاری هەیە و بەتایبەت بەردەوام لەگەڵی خەریکە. ئەو لەگەڵ ڕاهێنان و هێدی هێدی زاڵبوونە بەسەر هونەرەکەدا. ئەو تەواو دژی بۆچوونی ئەو تازەکارانەیە کە کەم تاقەت و کەم چیکڵدانە دەنوێنن. ئەو کەسەی کە پێی وایە ئەو کارە وەك دەزگـای ئـۆتـۆمـات وایـە کـە پـارەکـەی تـێ هـاوێژێ و لـەولاوە مـیـمـیك و نـیشـانـەکـانـی زمـانـی لـەش بـێنـە درێ، دەبـێ بـزانـێ ئـەم کـارە بـەپـەلـە سەرنـاگـرێ. لـەبـەر ئـەوەی ئێوە تـێ گـەیشتوون، کـە فێربـوونـی مـیـمـیك و نیشانەکانی زمانی لەش پرۆسەیە، کە وتاربێژ دەبێ ئەم پرۆسەیە تێ پەڕێنێ، جا هەر بۆیە بێگومان ئێستا حەز دەکەن ئەوەی کە فێری بوون لە کارەکەتاندا بەکاری بهێنن.

لە نیو ئەو تێمانەی کە لە خوارەوە پێشنیار دەکرێن، تیمێك هەڵبژێرن و بـەکـەڵك وەرگرتـن لـە نیشانـەکـانـی زمـانـی لـەش، لـەگـەڵ هـاوکـارەکـەتـان پڕۆڤەی بکەن.

### بابەتەکان بۆ پڕۆڤە کردن

| | |
|---|---|
| باخەکەی من و دنیایەك سەوزیجات | نیشتمانی من |
| ئەو سروشتەی کە من تێیدا دەژیم | گیانلەبەرەکەم، باشترین دۆستی من |
| جوانترین شوێنی سەفەری من | پیاسە کردنێك لە پایزدا |
| ئاوا بوونی خۆر لەسەر دەریا | بەهار، ژیانەوەی سروشت |
| هەڵهاتنی خۆر لە شاخەکان | بۆ هەوارچوونی پەلەوەر لە پایزدا |

### وتار هاوڕێ لەگەڵ نیشانەکانی زمانی لەش

لـە حـەکـایـەتـەکـەی "ئـەستێرەدا" دیـتـمـان کـە نـیشـانـەکـانـی زمـانـی لـەش، پەیوەندییان بەتێم و بابەتەکە و ئەو کەسەی کە وتارەکە پێشکەش دەکات

هــەیــە.هــەروەهــا تــێمــپــۆی [نــزمــی و بــەرزی و هــێدی و بــەپــەلــە]ی جووڵانەوەکان دەوری هەیە. وەك نموونە ئەم تێمە [بابەت]ە هەڵبژێرن ژوورەکــەی مــن، دەوروبــەری مــن لــە نــاو ژوورێك بــەڕەنــگێکــی ڕۆشن و ڕازانــدنــەوەیــەکــی زیــنــدوودا بــێگومــان دەتوانــێ بــەتــیمــپــۆیــەکــی تــونــدتــر و جووڵانەوەیەکی زیندوو وتارەکەت پێشکەش بکەی، بەڵام بەپێچەوانە لە ژوورێکــی بــێدەنگ بــەڕەنــگــی مــات و تــاریــکــەوە جــووڵانــەوەکــانــی تــۆش دووچاری ماتی دەبن. ڕەنگە وەك کەسێکی ڕەسمی و دەوڵەتی، زۆر لە ژیانی سروشتی دوور کەوتبینەوە؟ بەو حاڵە دەبێ یەکێك لەو بابەتانەی کــە پــێتــان پــێشنــیــار کــراوە، واتــە سروشت بــکــەنــە بــابــەتــی وتــارێك و بەشێوەیەکی پڕ لە خۆشەویستی باسی لێوە بکەن. لێ گەڕێن لە حاڵەتێکی وادا هەست و ئیحساس دەرکەوێ و تێ بکۆشن بەگوێرەی ئیمکان باس لە سروشت بەشێوەیەکی زیندوو و ڕەنگی، بهێنە گۆڕێ.

ئێستا هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵهێنەوە و دەرکەون و بابەتەکەتان لە ڕێگــای زمــان و مــیمــیك و نیشانــەکــانــی زمــانــی لــەشەوە پێشکــەش بــکــەن. سەرنج بدەن کە باسەکەتان تەواو ئازاد بی، ئەنیشکتان حاڵەتی ترسی تێدا نەبێت و بەلەشتانەوە نەلکابێت.

پاش تەواوبوونی قسەکان و دەرخستنی تواناکانتان، دەتوانن دەورەکە لەگەڵ هاوکارەکەتان بگۆڕنەوە. دوای کۆتایی هاتنی ئەو تێمە، دەتوانن تێم و بابەتێکی دی بۆ تەمرین کردن هەڵبژێرن.

## تێمپۆی زمان

پاش ئەنجامدانی ئەم تەمرینە کە باسکردن لە سروشت بوو، کارکردن لەسەر ئەم دوو شیعرەی گوێتە (گۆتە)، ئەرکی تازەتانە. بۆ ئەنجامدانی ئازاد قسەکردن، دەبێ فێربن، کە چۆن تیمپۆی قسەکردن بگۆڕن، بۆ ئەوە لــە هــەر کــاتــێکــدا کــێشی قسەکــردن دەوڵــەمــەند ڕاگرن و بــەردەوام بن لــە

پێشکەش کردنی وتارەکەدا. گۆڕینی دینامیکی قسەکردن لە قسەکردنی پڕ هێزەوە بۆ قسەکردنێکی بەر لەو لە وانەکانی پێشوودا فێربوون، ئێستا دەبێ فێربن، بتوانن تیمپۆی قسەکردن بگۆڕن.

ئەم دوو شیعرە بخوێنەوە، تێ بکۆشە تیمپۆی خوێندنەوە بگۆڕی وەك چۆن لە مۆسیقادا باوە، تیمپۆی ئارام و هێدی: ADAGIO,LARGO

تیمپۆی مام ناوەندی: ANDANTE

تیمپۆی بەپڕتاو: ALLEGRO,PRESTO

## بێدەنگیی دەریا

بێدەنگییەکی قووڵ زاڵە لە ناو ئاودا
دەریا دوور لە جووڵە ئارامە
وکەشتییەوان خەمناك دیارە
دەوەرەکە پانتاییەکی بێ گەردە.
هیچ هەوایەك لە هیچ لایەکەوە نییە!
وستکوتی مەرگباری ترسناك!
لە دوورێکی گەلێك گەلێك دوورەوە
جووڵەی شەپۆلێك نییە.

## ڕۆیشتنی پڕ لە شانس

تەمومژ بڕەوێنە،
ئاسمان کراوەیە،
و "خوای با" دێنێ
هەودای ترس.

هاژەی با دێت،

کەشتییەوان وەڕێ دەکەوێت.

بەپڕتاو! بەپڕتاو!

شەپۆلەکان دەربڕدرێن،

دوور نزیك دەبێتەوە،

نەها من ولات دەبینم!

پاش پەیداکردنی تێمپۆی تایبەت، بەخۆتان، دەبێ بەردەوام بن لە کارکردندا، تەماشای ئەو تێستەی خوارەوە مەکەن تا ئەو کاتەی تێمپۆی تایبەت بەخۆتان پەیدا نەکردووە.

ئێوە بۆ شیعری بێدەنگی دەریا، تێمپۆی ئارامتان هەڵبژاردووە، ئەم تێمپۆ ئارامە دەبێت لە هەموو وتارەکەدا بپارێزرێ. خۆتان لە جێگای کەشتییەوان دابنێن. ئەو لەسەر دەریایە و دەوروبەری هەتا چاو کاردەکات بێدەنگی و ترسە. لە دەوروبەری ئەو بەپانتاییەکی یەکجار زۆر، هیچ زیندەوەرێك جگە لە خۆی نابینێ، ئەو سەرەڕای ئینسان بوونی، توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی لە دەست داوە و توانا و هێزی سروشت بەسەریدا زاڵە. بێ جووڵەیی و مەندبوونی ئاو بێنە بەرچاوی خۆت. هەر بەرزی و نزمیی دەنگ، کە دەکرێ لەگەڵ هەستان و نیشتنەوەی جووڵەی ئاو بەرابەر بکرێ، دەکەوێتە مەیدان. بەوجۆرەناوەرۆکی شیعرەکە نزیکتر دەبێتەوە، ئەگەر لەسەر هەر دێڕێك کاربکرێ، واتە دێڕ بەدێڕ تۆن ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت. بۆ ئەوەی پانوبەرینی و دووریی دەریا دەربکەوێ، دەبێ دێڕەکانی ٣ هەتا ٤ و ٧ هەتا ٨ بەیەکەو سەرجەم بخوێندرێتەوە.

## دەرخستنی تایبەتمەندییەکان

سەرەڕای بوونی ئەو مەرتەبانە لە شیعرەکەدا، مرۆڤ بێ نەتیجە بەشوێنی بەرزترین شوێنی [ترۆپکی] شیعرەکەدا دەگەڕێ، بۆ ئەوە لەوێوە شیعرەکە کۆنترۆڵ بکات. مرۆڤ ئەگەر سەیری دێڕی ٦ بکات، دەبینێ دێرەکە لە ئەوپەڕی کورتی خۆی دایە. مرۆڤ دەتوانێ لێرەدا باسی نزمترین خاڵی بکات، کە شاعیر لێرەدا لە ڕێگای دوو وشەی بەهێزەوە کارێکی وا دەکات کە وشەکان بۆ خۆیان دەدوێن [قسە دەکەن]: وستکوتی مەرگباری ترسناك. ئەم عونسورە بەهێزەی دەربڕین لە ڕێگای لێ زیادکردنەوە پێك نەهاتووە، بەڵکو لە ڕێگای کورت کردنەوە پێك هاتووە.

ئەمە لە کاتی ئازاد قسەکردندا مانای ئەوەیە:

* بیروفیکرێك، کە ئێوە دەتانەوێ بەرجەستەی کەنەوە، دەکرێ لە حاڵەتی تایبەتیدا بەدەست بێت، ئەویش بەچەشنێك کە لەو شوێنەدا دیناميك سەربخرێ، واتە بەرزکردنەوەی دەنگ

* حاڵەتێکی دی کە بەتایبەت کاردەکاتە سەر گوتنەکە ئەوەیە، کە ئێوە لە حاڵەتێکی دینامیکەوە لە ناکاو داکەونە خوارێ و حاڵەتی دەنگ بگۆڕدرێ. ئەم تەکنیکە تەنیا وەختایەك دەتوانێ سەرکەوتوو بێت، کە ئێوە پێش و پاش بەکارهێنانی دیناميك بەئەندازەی پێویست هێزی دەنگ بەکاربێنن، بۆ ئەوە بگەڕێنەوە سەر گوتنی ئارام و هێدی و ئەم حاڵەتە ببێتە شێوەی بەرچاو.

ئەم وشانە کە لێرەدا دەگوترێن دەتوانین وەك وێنەیەك [عەکسێك] دای بنێین، کە لە [قەتحە]یەك گیراوە. هەر دووکیان واتە قەتحەکە و وێنەکە گرێدراوی یەکترن، لە پێشدا قەتحەکە سەرنج ڕادەکێشێ، دوایە وێنەکە. لە شوێنی نزمترین خاڵی شیعرەکەدا، دێری ٦، دوو شت بۆ ئێوە دەردەکەوێ، یەکەم نەمانی دیناميك و دووهەم نزم بوونەوەی دەنگ.

ئەم حاڵەتە وا دەکات کە دوو ڕستەی پاش و پێش ئاگایانە لە پلەیەکی دەنگدا بگوترێن. چۆنیەتیی داڕشتنی دەنگ، لێرەدا لەو شێوانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

هیچ هیوایەك لە ... لە دووریێکی گەلێك...

وستکوتی مەرگباری ترسناك! [بەرزترین شوێن]

ئێستا ئێوە ئەو شیعرە "بێ دەنگیی دەریا" پێشکەش دەکەن. لێ گەڕێن ئارامی لە ناو دەروونتاندا بگەڕێ، بۆ ئەوە بتوانن هێدی هێدی تێمپۆی دڵخواز پەیدا بکەن. ئارام قسەکردن، کە ئێوە دەبێ لێرە پرۆڤەی بکەن، بۆ زۆر کەس کارێکی زۆر زۆر دژوارە. دژوار لەبەر ئەوە کە داواکاریەکانی ژیانی ڕۆژانە وەك سێلاوێك ئێوە دەکێشن بۆ ناو قسەکردن و ئەوە دەبێتە بەشێك لە کەسایەتیی ئێوە. گۆڕینی ئەم عادەتە پێویستی بەپرۆڤە و کار هەیە.

**یارمەتی**

ئەگەر ئێوە ناتوانن خۆتان پەیدابکەن، دەبێ ڕێگایەکی دی بگرنە بەر. چەند جۆرە ڕەنگی ئاوی [شین] هەڵبگرن و تێکەڵ بەڕەنگی مات و تاریك، وێنەی دەریا بکێشن بەچەشنێك کە تەنیا ئاو و تاقە پاپۆڕێك بەرچاو بکەوێ. ڕەنگی ئاسمان دەبێ لەگەڵ ڕەنگی ماتی دەریا، یەکتر بگرنەوە. لەم وێنەدا نابێت جووڵەی شەپۆلی دەریا ببیندرێ.

ئەم پرەنسیبە دەبێ لە کاتی خوێندنەوەی شیعرەکەشدا بەکاربهێندرێ: هیچ چەشنە جووڵەی شەپۆلێك نابێ لە دەنگدا بەکاربهێندرێ، تەنیا لەسەر یەك پلە بەکەڵك وەرگرتن لە چەند جۆرە تۆن دەبێ دەنگ بەردەوام بێت هەتا دابەزینی دەنگ لە قووڵترین شوێنی شیعرەکە: وستکوتی مەرگباری ترسناك! هەر کاتێك ئەم شیعرەتان لە ناخی دەروون و باوەڕمەندییەوە خوێندەوە، تەنیا ئەو کات دەتوانن بچنەسەر پرۆژەیەکی

دی. ئایا بەگوێرەی پێویست قسەتان کردوە؟ ئەگەر نا، کەوایە دەبێ درێژە بەپرۆڤەکردن بدەن و توانایی خۆتان لە دوو بەشی توانایی گۆڕین لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر و هێزی دەربڕین بەتاقی کەنەوە.

## بەراوردکردن

هەر دوو شیعرەکە بێدەنگیی دەریا و "ڕۆیشتنی بەختەوەرانە" [پڕ لە شانس] لە پەیوەندی لەگەڵ یەکدان، کە مەرگی بێدەنگ وەبیر دەهێنێتەوە، و ئەوجا بەشوێنیدا ئەو شیعرە دێت، کە وەخەبەر هێنانە بۆ ژیان. بێگومان لەبەشی دووەمی تێکستەکەدا، چەشنەگوتن و تێمپۆی بەرزتان هەڵبژاردووە، بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی شیعرەکە بەرچاوتر و مانا ئاشکراتر بێت. بەڵام وشیار بن: وێژەر دەبێ هەموو هەناسەکەی بەش بکات – ئەوەش وەك ئەوە وایە، کە کەشتییەوان، کە لەگەڵ تۆفانی پڕ هێز ڕووبەڕوو دەبێ، کە "خوای با" دەینێرێ، ئەویش "هەودای ترس" دەهێنێ.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی کورت وا دەنوێنێ کە دووری گەلێك گەلێك دوور کۆتایی پێ دێت. مرۆڤ وا هەست دەکات کە پاپۆڕ و کەناری دەریا بەرەو ڕووی یەکتر دێن، و وڵات لەگەڵ خۆی جووڵانەوە دەهێنێ. [دووری دوور نزیك دەبێتەوە]

ئەگەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەم شیعرەدا، پێویست بێت چەندجارێك هەناسەهەڵکێشن و بیدەنەوە، شەپۆلەکانی جووڵە دوچاری دابڕان دەبێت. لە شیعرەکەدا تەنیا دوو شوێن هەیە کە دەکری کورتە پشووی تێدا بێ، و ئەوەش بۆ تازە کردنەوەی هەناسە کەڵکی لێوەردەگیرێ: جارێك لە کۆتاییی دێڕی ٤. "هەودای ترس و کۆتاییی دیڕی ٩، دوور نزیك دەبێتەوە..."

جاری دووهەم بۆ پشوودانی تازەکردنەوەی هەناسە، ئەو شوێنەیە کە دێڕی کۆتایی دەگوترێ. ئەم دێرە گرینگترین دیڕە، لەبەر ئەوە لەم

شوێنەدایە کە سەر ئەنجام هەوای مەرگ دەرەوێندرێ. هەموو کۆنترۆڵی تێمپۆی باڵای شیعرەکە لە گرێوی کرانەوەی ئەم دێرەی کۆتاییدا خۆی دەبینێتەوە. باشتر وایە هەر شوێنێکی پشووی تازەکردنەوەی هەناسە لە ناو تێکستەکەدا بەخەتێکی خوار[/] نیشانەی بکەن، دیاریی بکەن، ئەمە زۆر یارمەتی دەدات لە کاتی خوێندنەوەدا.

**دێری کۆتاییی وتار**

لە پێشدا ئەم دوو دێرەی شیعرەکە بخوێنەوە:

Presto دوور نزیك دەبێتەوە

Ritardando نەها  ولاّت دەبینم!

لێرە بەپێ هەڵسەنگاندنی خۆتان تۆنی دەنگ بەرز و لەسەرێ بگرن و ئەوجا وشە بەوشە دێری کۆتایی پلە بەپلە بەرزاییی دەنك بهێنە خوارێ.

نەها

من

ولاّت

دەبینم

بەلاّم ئەوەش گرینگە کە هێدی ببینیەوە. وشەکان لە ڕێگای کێشی پشوودانەوە لە یەك جیاکەنەوە. ئەمە خاڵێکە، کە دەتوانێ بۆتان دەربخات، کە ئایا ئێوە بەگوێرەی پێویست ئەو ئارامیەتان پەیدا کردووە بۆ پێشکەش کردنی وتارەکەتان، ئایا چەندە بەڕێك و پێکی فێربوون و چەندە زاڵن بەسەریدا، چەندە شارەزان لە دەرهێنان و بەڕێوەبردنی وتار پێشکەش کردندا.

### وتار

ئێستا هەموو شیعرەکەی "ڕۆیشتنی پڕ لە شانس" بخوێننەوە و بۆ ئەوە دەنگێکی بەرز هەڵبژێرن، لە دێری کۆتاییدا وشە بەوشە لە تۆنی دەنگ کەم بکەنەوە. ئەگەر لە سەرەتا بەگوڕ و هێزەوە دەستتان پێکردو نابێ خۆ بدۆڕێنن. گرینگ ئەوەیە، ئێوە لە ناو خۆتانەوە ئەم حاڵەتە دەردەبڕن. ئەم تەمرینە پێویستی بەکارامەیی زۆر هەیە و دەبێ چەند جارێك دوبارە بکرێتەوە. ئەگەر ئێوە لێخوڕی ماشێن بن، دەزانن کە لە سەرەتای دەست پێکردنی ماشێن لێخوڕین هەر بەم چەشنە بووە: تورمز ساتپ گرتن و گاز دان، دەبێ بەردەوام پڕڤە بکرێت هەتا ئەو کاتە مرۆڤ ڕادێ و زاڵ دەبێ بەسەریدا. لێرەش دەبێ سەبر و حەوسەڵەی تەواوتان هەبێ هەتا لە کاتی خوێندنەوەی تێکستدا باش فێربن تیمپۆ بگۆڕن، بۆ ئەوەش پێویست بەکات هەیە. ئێستا وتارەکەتان پێشکەش بکەن.

### داڕشتنی ناوەرۆك

مارتین والزێر، شارەزای گەورەی زمان، جارێکیان لە دەستپێکی شیعر خوێندنەوەدا داوای لێبووردنی لە خەڵك کرد کە ناتوانێ شیعرە تازەکانی کە لە تازەترین کتێبدا چاپ بووە، بیخوێنێتەوە، هەر بۆیە شیعرە کۆنەکان دەخوێنێتەوە. ئەو بەزەقی باسی کرد کە ئەو هێشتا بەسەر شیعرە تازەکاندا زاڵ نییە.

ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵك جێگای سەر سووڕمان بوو، ئەو شیعرانە بەرهەمی خۆی بوو. بەڵام دوایە خەڵك لە درێژەی شەوەکە لێیان حاڵی بوو کە ئەو کابرایە چ هونەرێکی بەرز بەکاردێنێ و چەندە کارێکی قورس و گران ئەنجام دەدات و چۆن زمان و هونەری گوتن و داڕشتنی شیعرەکانی لە یەك گرێ دەدات.

چۆن مارتین والزێر نایەوێت تەنیا خۆی بگەیەنێتە گوێچکەی بیسەر بەڵکو ئەو دەیەوێ خۆی بگەیەنێتە دەروونی خەڵك، ئێوەش لە کاتی وتاربێژیدا تێ بکۆشن، ناوەرۆکی شیعرەکە بەدوای یەکدا بخوێننەوە و تایبەتمەندییەکانی هەر کام لە شیعرەکانیش لە بەرچاو بگرن.

ئێوە ئێستا لەو دوو شیعرەدا لەگەڵ کارێکی دژوار ڕووبەڕوون و دەبێ لە پێشدا ئەوە لە بەرچاوتان بێت کە مەبەستی دیاریکراو لە خوێندنەوەی شیعرەکەدا، بپێکن. بەڵام سەرەڕای دژواری دەبێت ئەم تەکنیکە فێربن، بۆ ئەوە لە داهاتوودا بتوانن ئازادانە وتار پێشکەش بکەن.

ئێستا جارێکی دی هەر دوو شیعرەکە بگرنە دەست و وەرنە پێش و دەرکەون و بۆ خوێندنەوەی شیعرەکان. جیاوازی تێمپۆ لە کاتی خوێندنەوەدا ئیتر دەبێ لە گۆشت و خوێنتاندا بەدی بکرێ: تێمپۆی زۆر ئارام بۆ شیعری یەکەم و تێمپۆی زۆر بەرز بۆ شیعری دووەم.

## لێکدانەوەی وتار

ئێستا بۆ ئەوەی بتوانن بەخێرایی خوێندنەوەی جیاواز بەکاربێنن، لە کاتی پێشکەش کردنی وتار بەشێوەی ئازاد، دەبێ یەکێك لەو تێم و بابەتانەی خوارەوە هەڵبژێرن.

**بابەتەکان**

ئاگرگرتنی ماڵ لە نیوە شەودا

باهۆزێکی بەهێز لە ڕێدایە

بیدەنگیی بەر لە ئاگر گرتن و بەر لە هاتنی باهۆزەکە باس بکەن: تێمپۆی ئارام و هێدی. پێش ئەوەی ڕووداوەکە بگاتە حاڵەتی درامی خۆی هەڵسوکەوتی ئینسان و زیندەوەرەکان لە بەرچاو بگرن: تێمپۆی خێرا و پشووبڕ. چەشنی قسەکردنی کۆتایی لێرەدا دەبێ بەتایبەت

بەسەرنجدانێکی زۆرەوە بەکاربێت.

توانایی خۆتان هەڵسەنگێنن بەتۆمارکردنی دەنگتان بەیارمەتیی دەزگای تۆمارکردنی دەنگ. ئەم پرۆڤەیە دەبێت بەردەوام دووبارە بکرێتەوە جا چ تۆمار بکەن یا نەیکەن. ئەگەر تۆنی دەنگەکان واتە تیمپۆی ئارام و هێدی و تێمپۆی خێرا و بەپرتاو، زۆر جیاوازی دەرنەخەن و لە یەك نزيك بن دەبێت بەردەوام بن لە پرۆڤەکردن هەتا ئەم جیاوازییە بەدیار و ئاشکرا بێت، بۆ ئەوەش دەبێ تێکستەکە لە سەرراوە بخوێندرێتەوە. کاتێك لەم کارەدا سەرکەوتن ئەوجا دەبێت میمیك و نیشانەکانی زمانی لەش بەکاربێنن بۆ ئەوەش بتوانن لەگەڵ هاوکارەکەتان ئەم بەشە بەباشی کۆنترۆڵ بکەن، باشتروایە فیلمی ڤیدیویی لە کارەکەتان هەڵگرنەوە.

پاش کۆتایی هاتنی پرۆڤەکەی ئێوە، ئەوجا دەبێ هاوکارەکەتان دەورەکەی خۆی بگێڕێ و ئێوە سەرنج بدەنە سەر کاری ئەو. لێرەش تۆ نابێ کۆنترۆڵی کاری هاوکارەکەت هەواڵە بکەی بەتۆمارکردنی دەنگ یان فیلم هەڵگرتن، دەبێ زۆر جیدی گوێ بدەیە قسەکانی و سەرنج بدەیە میمیك و چۆنییەتی بەکارهێنانی نیشانەکانی زمانی لەش. بۆ ئەوەش دەبێ تەواو ڕەخنەگرانە مامەڵە لەگەڵ کارەکەدا بکرێ. باشە؟

وانەی ٩

## هەستی خۆ نرخاندنی وتاربێژ

زۆربەی بەشدارانی کورسی فێربوونی هونەری وتاربێژی، پاش کاری ڕۆژانە وەخت بۆ فێربوونی ئەو هونەرە پەیدا دەکەن. ئەو کەسانە پاش ٨ سەعات کار لە ئیدارە و یان ١٢ سەعات کار لە ماڵێ بەشداری لە کورسەکاندا دەکەن. هەروەها ئەو هێز و مەیلەی کە مرۆڤ لە سەر لە بەیانی بۆ کارکردن هەیەتی، لای ئێوارە و شەوێ پاش کاری ڕۆژانە خۆی لە کزی دەدا و زۆری لێ نامێنێتەوە. بەڵام کارێکی وانابێت وەك بار لەسەر شان سەیربکرێ. ڕیتمی سروشتیی حەسانەوە و ئارامییش بنەمایە بۆ ئامادە بوونی لەش، زمانی لەش و دەروونی مرۆڤ. تەنیا لەم سێ گۆشەیەدا ئیمکانی دروست کردنی کەسایەتیی وێژەری و وتاربێژی هەیە. لە گروپە جیاوازەکاندا، مرۆڤ دەبینێ کە ئەنجامدانی کایە و گەمە لە پرۆڤەکان بۆ ئامادەکردنی لەش لای بەشداران بەخۆشییەوە وەردەگیرێ. پاش ئەنجامدانی ئەم چەشنە تەمرینانە، ئەندامانی گرووپەکە دانیشتن و لێکیان داوە کە خاڵە پۆزەتیڤەکان کە وەبەر چاویان کەوتووە چییە:

* دەستەکان و باقیی شوێنەکانی لەش، گەرم دا هاتوون.
* بەشداران ئیتر هەست بەماندوویی ناکەن، بەڵکو دیسان ئامادەن بۆ وەرگرتنی شتی نوێ.
* هەنگاوەکانی فێربوون ئەرخایەن و جێگیرتر هەڵدەهێندرێنەوە.
* بۆ دەربڕین و شێوەی قسەکردنیش مرۆڤ کارێکی ئەنجام داوە: بەشداران هەست بەوە دەکەن باشتر لە قسەکانی یەکتر حاڵی دەبن، قسەکان باشتر دەگاتە گوێچکەی ئەوان.
* ئەوان لە ڕێگای بەخێرایی فێربوون و بەردەوام لەبەرکردن، ڕادەی توانای لەبەرکردنی خۆیان بردووەتە سەرێ، بەوجۆرە لە ڕێگای

تەمرینەوە، مێشکیان ئامادەگیی باشتر بۆ فێربوون و لەبەرکردن پەیدا کردووە.

* لە ڕێگای جوولّە و خۆ بزواندنەوە قۆڵ و باسك گەرمتر و ئازادتر بوون و ئیتر لە ترسان چیر و کۆ نەبوونەتەوە و نەلکاون بەلەشەوە و ئامادەن بۆ ئەنجامدانی نیشانەکانی زمانی لەش.
* سیستمی مۆرەکانی پشتیش بەشداریی لەم جووڵانەوە و پرۆڤەیەدا کردووە و بەجۆری ئەکتیڤ ئامادەی خزمەت کردنە.

## دەرکەوتنی ئازادانە

ئێوە ئێستا بۆخۆتان دەتوانن پرڤەی جووڵانەوە بکەن و بەردەوام تەمرین بکەن، هەتا هارمۆنیی جووڵانەوەکانی خۆتان باشتر بکەن. لەم ڕێگایەوە دەتوانن دەرکەوتنێکی پتەو و ئازاد و کراوەتان هەبێ لە بەرامبەر بیسەران و بینەراندا. دڵنیا نەبوون، درەنگ کردن و سەبرکردن لە دەرکەوتن لە لایەن وتاربێژەوە کار دەکاتە سەر ناوەرۆك و فۆڕمی وتارەکە. چەندە زۆرتر کار دەکاتە سەر بینەر و بیسەر، کاتێك وێژەر و وتاربێژ باوەڕمەندبێ بەخۆی و لە ڕەنگ و ڕوخسارییەوە ئەم باوەڕمەندییە دەردەکەوێ: هیچ شتێك من لە مەیدان دەرناکات، من لە بەرامبەر تەواویاندا ڕاوەستاوم.

ئەم تێکستەی خوارەوە بەچاو بخوێنەوە. لە تاکتی ٣/٤دا بۆتان دەردەکەوێت ، کە سەما کردنێك لە پێشتانە. لەو پەیوەندییەدا دوو کاراکتێر لە بەشی جیا جیا لە یەکتر خۆ دەردەخەن: "توند" و "هێدی".

لە پێشدا تێکستەکە بخوێنەوە و هەوڵ بدە لە کاتی بەرز قسەکردندا، ڕیتم لەگەڵ تەواوی تۆنەکان بەکاربهێنی.

تێکستی ٣/٤ تاکت [بەخێرایی]




تێکستی ٣/٤ تاکت [بەشێنەیی]




[سەرنج بدەن، لێرە نۆتەکان بەپێی نووسراوە کوردییەکە لە ڕاستەوە بۆ چەپ نووسراون].



تێکستی ٣/٤ تاکت [بەخێرایی]

لە تێکەڵ بوونی سێ- ڕیتمدا، دێر- و دووبارەکردنەوەی وشە، ئێمە لەگەڵ تێکستێکی کایە ئاسا [تێکستی گەمە ئاسا] ڕووبەڕووین. لە بەشی

یەکەم جووڵە هێنەر، سەماکەر لە حاڵەتێکدایە، کە ئێش و ئازاری خۆی لە بیر بکات، لەبەر ئەوەی ئەو خۆی لە جێژنێکدا دەبینێتەوە. لە بەرامبەر ئەوەدا لە بەشی دووەم، بیرکردنەوە لە کارەکە وات لێ دەکات ژان و ئازار گەورەتر بێت و مرۆڤ بەزەحمەت خۆی بکێشێ و پای نەخۆش و پڕ ئێش ڕاکێش دەکرێ. لە کاتی دەست پێکردنی کارە پڕ ئازارەکەدا مرۆڤ لەگەڵ دەست پێکردنی هەر تاکتێکدا دەنوشتێتەوە و پاشان لەبەر هۆی قەبووڵ کردنی ئەرك و وەزیفە دیسان بەردەوام دەبێت.

ئەم پڕڤەیە باشترین ڕاهێنانە بۆ ستونی مۆرەکانی پشت.

## شل هەتا ستوونی مۆرەکانی پشت

″ئینسان بەقەرا ستوونی مۆرەکانی پشتی پیرە،″ ئەمە قسەی هیندییەکانە. هەر بۆیە بۆ ئەنجامدانی ئەم تەمرینەی خوارەوە کاتی زۆر تەرخان بکەن و خۆشتان زەحمەت بدەن بۆ ئەوەی هەموو لەش تەواو شل بکەن هەتا دەگاتە ستوونی مۆرەکانی پشت. هەر کەسێك ئەم تەمرینە گەلێك جار دووبارە بکاتەوە، ئەوە هێدی هێدی بەپێشکەوتنێك دەگات کە هەستێك بەرامبەر بەستوونی مۆرەکانی پشتی پێك بینێت. خۆ ئێوە ناتانەوێ لە ناو سینگێکی زیندانی کراو لە قاڵبێکی ئاسنیندا بجووڵێنەوە، بەڵکو وەك کەسێکی گیاندار دەتانەوێ لە پشت تریبوونی قسەکردن یان مێزی وێژەریدا ڕاوەستن.

ئایا تێکستی گەر من بچم بۆ سەما تەواو لەبەر دەیزانی؟ ئەگەر وەڵامەکەتان بەڵێ بێ، ئەوە لە کاتی پێشکەش کردندا دەتوانی جووڵانەوەشی لێ زیاد بکەی.

ئێوە لەسەر تاکت دەڕۆنە پێش، کاتێك دەست بەرەو بەرزایی دەڕوات و لە حاندی سەر جێ دەگرێ، چەپڵە لێ دەدەن، پاشان دەست لە حاڵەتی جووڵانەدا، دادەکەوێ و لە کۆتاییدا شل دەبێتەوە و بەرەو خوار دادەکەوێ.

ئێوە دەبێت هەست بەوە بکەن کە کێشی ئەم کارە هەتا ستوونی مۆرەکانی پشت دەڕوا.

**بەشی ١**

چەپڵە لێدان  چەپڵە لێدان 

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| گەر | من | بچم | بۆ | سە | ما |
| پا | ی | من | نا | یە | شێ |
| نا | یە | شێ | نا | یە | شێ |
| نا | یە | شێ | نا | یە | شێ |

| **بەشی ٢** |  |  | |  |  |
|---|---|---|---|---|---|
| بۆ | چە | گەر | من | ئەشێ | کار |
| کەم | –، | چۆن | دێ | شێ | پای |
| من | –، | ئۆ | وەی | –، | ئۆ |
| وەی | –، | ئۆ | وەی | –، | ئۆ |
| وەی | | | | | |

بۆچە گەر من ئەشێ کار کەم، چۆن ئێشێ پای من، ئۆ وەی، ئۆ وەی لە کاتی گوتنی ئەم تێکستەدا ئیتر چەپڵە لێ نادەن. لێرە خۆتان قیت و قنج ڕاناگرن، بەڵکو لە کاتی هەڵهێنانەوەی یەکەم هەنگاو تەواو بەسەر ئەژنۆدا کووڕ دەبنەوە. لێرە بیر لە ستوونی پشت بکەنەوە و سەرنج بدەن سەر دەبێ لەگەڵ جووڵانەوەکانی ستوونی مۆرەکان پشت خۆی ڕێك بخات.

## دیار و ئاشکرا قسەکردن

لەگەڵ ئەم جووڵانەوەیەدا، تەمرینی قسەکردن ئەنجام دەدریٚ. ئەو هەموو دووبارەبوونەوە لە خۆڕاوە لە پرۆڤەی سەماکەی ئێمەدا نەهاتوون. لەو جێگایانەدا دەتوانن لە کاتی گوتندا چۆنییەتیی گوتنی خۆتان ئەکتیڤ بکەن.

لە تێکستەکەدا لە ژێر پیتە بیٚ دەنگیەکانی پ، س و هەروەها پیتەکانی د، م لە دەستپێکی وشەکاندا خەت بکێشن. ئێوە دەتوانن بیسەلمێنن کە زمانەکە چەندە دەوڵەمەندە لە دەنگەکانی ئاهەنگداردا. [مەبەست زمانی ئەڵمانییە]. تەنیا کاتێك بیسەران هەتا ڕیزی ئاخر [ئاکوستیك] باش لە ئێوە دەگەن کە دەنگەکان بەتەواوی گۆ بکرێن، بەیان بکرێن و بێنە سەر زمان. ئەو ماندووبوونەی کە لە کاتی پرۆڤەکردندا دەیکێشن ئە لێرەدا ساز دەبیٚ، گەلێك جاران دووبارەی بکەنەوە. لەم پەیوەندییەدا خوێندنەوەی پیتەکانی بێدەنگی سەرەتای وشەکان پ، س، ش، د، م لە بەرچاو بگرن و لە خوێندنەوەیدا بەردەوام بن.

## کێش لە وتاردا

لە ڕێگای تەمرینی پێشوا ئازادبوون و لەگەڵ جووڵەکردنیش ڕاهاتوون. ئەم حاڵەتە جیرپیە[وەکو و جیڕ (کێش)، مرۆڤ کێشی لەشی زۆرترە و جووڵەکردن بۆی ڕاحەتتر و ئازادترە] دەبیٚ بەردەوام بپارێزن بۆ ئەوە بتوانن لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دی بەباشی بچن.

بیسەرێك تەنیا لە ڕێگای دەنگەوە قسە وەرناگریٚ، بەڵکو ئەو دەیەوێت بەشداربێت و [کورد گوتەنی سەر هەتا پیٚ [گویٚ] بێت. لێرە بەکارهێنانی نیشانەکان زمانی لەش و کەرەسەکانی وتاربێژی دەبنە پێکهێنەری کێش لە قسەکردندا. نیشانەکانی زمانی لەش بۆ ئێوە ئاسان دەنوێنیٚ.

پرسیارەکانی تایبەت بە[ڕێتوریك] کە ئێستا لەگەڵیان خەریك دەبین، زۆر زوو لە لایەن ئێوەوە وەڵامیان دەدرێتەوە. چیرۆکی تاج لە سەرنانێکی سەر سووڕهێنەر لە "کوێنیگس بورگ" بخوێنەوە، تا ئەو جێگایەی ناوەرۆکەکەی وەك ئاواز بێتە بەرتان و لە مێشکتاندا جێ بگرێ. ژمارەکانی کەناری ڕستەکان، نیشانەی بەشەکانە کە دواتر دەبێ ئاوڕیان لێ بدەنەوە.

## تاج لە سەرنانی سەرسووڕهێنەر

١- لە زەمانێکی گەلێك زوودا، کابرایەکی جووتیار دەژیا، ئەو سێ کوڕی هەبوون. دوو لە کوڕەکانی گەورە و بەهێز و توانا بوون، بەڵام لە خۆ ڕازی و بەرچاو تەنگ بوون، برای گچکە بچکۆلانە و لاواز بوو، بەڵام زۆرباش و عاقڵ بوو. دوو برا گەورەکەی پێ دەکەنین و گاڵتەیان پێ دەکرد، بۆ هیچ جێگایەك لەگەڵ خۆیان نەیاندەبرد و ناویان نا بوو "ئاشێن پوتل"، لەبەر ئەوەی لە ماڵێ دایم لە ناو خۆڵەمێشدا دادەنیشت.

٢- ڕۆژێك لە ڕۆژان کارەساتێك قەوما، ئەویش مردنی شا بوو. لە هەموو وڵاتدا بانگەوازیان کرد، کە دەبێت هەموو خەڵکان لە گۆڕەپانی پڕ لە سەوزایی شاهنەشاهدا کۆببنەوە.

لەوێ خوداوەند تاجی شاهنەشاهی لە سەری ئەو کەسە دەنێ کە لە هەموو کەس زۆرتر خۆشی دەوێت.

٣- دووبرا گەورە خۆیان لە دەقدا و جلوبەرگی جوانیان لەبەر کردو کەوتنە ڕێگا بۆ سەفەر. برا گچکە داوای کرد، کە ئەویش لەگەڵیان بچێت، بەڵام وەڵامیان داوە: دەبێ ئێمە بەتۆوە خۆمان تووشی سەرشۆڕی و نەدامەت بکەین؟ لە ناو خۆڵەمێشەکەدا بمێنەوە، کە شایانی خۆتە!

٤– بەڵام "ئاشین پوتل" خۆی بەدوای ئەواندا ڕادەکێشێ و دەچێتە گۆڕەپانی گەورەی چەمەن، ئەو شوێنەی کە تەواوی خەڵکان لێی کۆ بووبوونەوە، بەڵام ئەو ترسی لێ نیشتوو، کە نەکا براکانی چاویان پێی بکەوێ، و پاش لێدان بینێرنەوە ماڵێ. هەر بۆیە خۆی کێشایە ناو تەویلەیەکی پڕ لە بەراز کە لە دەرەوەی گۆڕەپانی گەورەی چەمەنەکە هەڵکەتبوو.

٥– کاتێك سەعاتی هەڵبژاردن بۆ تاجی شاهی گەیشت، تاجی شاهنەشاهییان بەقولاپێکەوە هەڵواسی و تەواوی زەنگوڵەکان کەوتنە دەنگ. تاجی شاهنشاهی هێدی هێدی هەڵکێشرا بۆ سەرێ و بەسەر تەواوی خەڵکەکەدا تێ پەڕی و هێدی هێدی ملی نا بۆ لای خوارەوە و یەك ڕاست بەرەو تەویلەی بەرازەکان دانەوی.

٦– خەڵکی تامەزرۆ بەخێرایی بەرەو تەویلە ڕادەکەن.

٧– لەوێ ئاشێن پوتلی هەژار و بچکۆلانەیان دیتەوە. خەڵك ئەویان بەرز کردەوە و لە بەرامبەر پادشای نوێدا چۆکیان دادا، کە خوداوەند گازی کردبوو، ئەوجا بەشادی و هەلهەلە بەرەو بارەگای گوێنگیس بورگ بەڕێیان کرد. برا لە خۆڕازییەکان سەرشۆڕانە گەڕانەوە ماڵێ.

بۆ ئەوەی ئەم حەکایەتە بەشێوەی ئازاد بتوانن پێشکەش بکەن، لە لاپەڕەیەکدا

٨– وشە گرینگەکان [وشەگەلی سەرەکی] بنووسنەوە. تێ بکۆشن بۆ هەر بەشێك سەرخەتێك [ناوێك] پەیدا بکەن، کە ڕەنگدانەوەی ناوەرۆکی ئەو بەشە بێت. ناوەکانی ناو چیرۆکەکە لە بیرتاندا بهێڵنەوە بۆ ئەوە پاشان لە کاتی داڕشتندا کەڵکی لێ وەرگرن. بۆ ئەوەی بەباشی وشە سەرەکییەکان بەکاربهێنن، بەخەتێکی گەورە لە لاپەڕەیەکی جیادا دانە دانە لە ژێر یەکتردا بیاننووسنەوە. بەیارمەتیی ئەم نموونەی خوارەوە دەتوانن نووسراوەکەی خۆتان تەماشا بکەن و کامڵتری کەن.

**لاپەڕەی وشە سەرەکییەکان**

| | |
|---|---|
| جووتیار و کوڕەکانی | جۆلانەکردنی تاج |
| مەرگی شا | خەڵکی تامەزرۆ بەخێرایی |
| سەفەری ئاشێن پوتل | شای نوێ |
| خۆشاردنەوە لە تەویلە | شەرمساریی براکان |

## بەرزکردنەوەی داواکارییەکان

بێگومان لە بڵیندگۆ(موکەبرە)ی ڕادیۆوە گوێتان لە ڕاپۆرتی وەرزشی بووە. ئێوە ڕەنگە گەلێك جار ئەو هەستەتان بووبێت کە بۆخۆتان لە شوێنی یارییەکەن. ڕێپۆرتێر باش دەزانێ کە نابێ کێشی ناو یارییەکە لە دەست بدات. ئەو هەر لە دەستپێکەوە هەوڵ دەدات ئەم کێشە پێك بێنێ و هەتا کۆتایی ڕایگرێ.

لە بەشی ٥ ی گێڕانەوەکەدا بیسەر لە فۆڕمێکی گونجاودا ئاگاداری ئاکامی چیرۆکەکە دەکرێ. بەڵام ئەمە کەمە. هەر بۆیە ئێوە ئەم بەشەی تێکستەکە پەرە پێ بدەن و دای ڕێژنەوە، بۆ ئەوە گرنگترین زانیاری– لەو جێگایەی تاجی شاهی دێتە خوار– بدەن بەخەڵك، بەپێی ئیمکان چیرۆکەکە درێژکەنەوە و کێشی چیرۆکەکە بەرزکەنەوە و سەرئەنجام [کۆتایی] وەپاش خەن. گەیشتن بەم ئەنجامە لە ڕێگای بەکارهێنانی تەکنیکی و دواخستن ئیمکانی هەیە:

تاجی شاهی لە پێشدا ڕاست [شاقولی] هەڵدەکێشرێتە سەرێ. دوو دڵ دەنوێنێ، لە جێی خۆی دەمێنێتەوە. دوو برا گەورە بەحاڵەتی نیگەرانییەوە سەیری ڕێگای خۆیان دەکەن هەر کامیان بەهیوا و نیگەران، حەز دەکەن و دەخوازن کە بەسەر سەری ئەواندا بێتە خوار.

دەکرێ لە ڕێگای خستنەگەڕی پرسیاری [ڕێتۆریکەوە] کێش پێك

بهێندرێ، واته پرسیاری سەر کاغەز، کە بیسەر چاوەڕوانی وەڵام نەکات: تاجی شاهی هەڵدەکشێتە سەر. بۆ کام لا دەیەوێت بجوولێتەوە؟ کێ هەڵدەبژێرێ؟ ئایا من هەڵبژاردەکە دەبم؟

تاجی شاهی بەسەر تەویلەی بەرازانەوە– ئەوە مانایەکی هەیە؟ نەکا خوداوەندی ئاسمان دووچاری هەڵە بووبێت؟

ئێستا دەتوانن دەست بکەن بەگۆڕینی تێکستەکە. بۆ ئەوەی لە سەرەتاوە کارەکەتان ئاسانتر بێتەوە لە پێشدا ئەم چەند ڕستەیەی ئێرە بەکاربێنن و پاشان بەشی ٥ پەرە پێ بدەن و بینووسنەوە بەم شێوەیەی خوارێ:

لەوێندەرێ تاجی شاهی بەسەر سەری هەموو خەڵکەکەدا هەڵدەکێشرێتە سەرێ. خەڵك هەموو دڵ نیگەران وەستاون. کێ لە وانە بۆی هەیە هەڵبژێردرێ؟ تاجی شاهی دەست دەکات بەگەڕان. لە ناکاو وا هەست پێ دەکرێ کە ئەرخاین نەبێ. لە جێی خۆی دەوەستێ بەلای ڕاستدا بادەداتەوە– ڕاستە و ڕاست بەرەو تەویلەی بەرازەکان مل دەنێ. بەڵام لەوێندەرێ ڕۆحی هیچ ئینسانێك بەرچاو ناکەوێ. ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ نەکا خوای ئاسمان تەواو لێی گۆڕابێ؟

**وتاری ئازاد**

پاش نووسینی وتارەکەتان لەسەر ئەم بەشە دیسان خۆتان لە تێکستە نووسراوەکە دوور خەنەوە، بۆ ئەوە بەشی ٥ ئازادانە بەپێی ئەو شتانەی کە لە زەینتاندا هەیە پێشکەش بکەن:

* تێ بکۆشن نیشانەکانی زمانی لەش بەکاربهێنن. باسکی ڕاست دەتوانێ بەشێوەیەکی ئارام شوێنی تاجی شاهی بنوێنێ. ئەو کەوانەی کە تاجەکە دەیپێوی بەڕاستی هەتا کۆتایی بینوێنن، نیشانی بدەن.
* بەکێش و هەیەجانەوە بیگێڕنەوە، کاتێك کە باسی پرسیارە بێ وەڵامەکان دەکەن، گێڕانەوەکە درێژبکەنەوە.

* لێ گەڕێن پاش هێنانە گۆڕی هەر پرسیارێك پشوودانێكی كێش بەشوێن پرسیارەكەدا بێت، بۆ ئەوە بیسەر ئیمكانی بیركردنەوە پەیدا بكات.

ئێستا دەست بكە بەپێشكەش كردنی وتارەكەت.

## پەرەپێدانی تێكست

لە تێكستی "تاج لە سەرنانی سەر سوورهێنەر"دا دەبێ ئێوەش سەرنجتان دابێ، كە بەشی ٦ تەنیا لە یەك دیر پێك هاتووە: "خەڵكی تامەزرۆ بەخێرایی بەرەو تەویلە ڕادەكەن." ئەم ڕستەیە لابەرن. بۆ ئەوەی گێڕانەوەیەكی ڕێكوپێك لەگەڵ هێنانەوەی نموونەی زۆر دەست بدات، لە وشە سەرەكییەكان كە لە سەر چیرۆكەكەیە كەڵك وەرگرن.

**وشە سەرەكییەكان**

بەپەلەبوون و بەخێرایی/ هێرشێكی بەپاڵە پەستۆ/ تا كەوشێك/ كیف (جانتا)یەك / بووكێكی مندالان/ چەترێك/ گەلێك ئەنیشك/ ئالۆزی و بشێوی/ منداڵێكی گریان/ پشیلەیەك لەسەر ڕێگا/ پەتێكی درێژی سەگ/ كەسێك دڵی لەخۆدەبێتەوە.

بەر لە هەر شت بەپەلەبوون و پاڵەپەستۆی خەڵك. بهێنە بەر نەزەر [خەڵكی سەرسام گرتوو ڕادەكەن]، هەر وەك چۆن لە فیلمدا نیشان دەدرێ. لە خوارەوە بۆ یارمەتیی خۆتان ئەو وشە گرینگانە كە دەتانەوێ گۆڕانكارییەكی تێدا بكەن لە خوارەوە بیانووسن و ڕوونكردنەوەی لێ زیاد بكەن. هەموو ئەوانە دەبێت لەسەر یەك ئەو پاڵەپەستۆیە نیشان بدەن. نیشانی بدەن كە چۆن ئێوە لە تێمپۆیێكی بالادا دەتانەوێ وەزعەكە ڕەنگ بداتەوە، و بزانن خاوەنی چ هێزێكی دەنگن. لە دەستپێكی وتارەكەدا دینامیكی كارەكەتان بەرز كەنەوە. لێگەڕێن با وشە گرینگەكان لەناكاو و ڕاستەوخۆ كارتان تێ بكەن و یەكسەر بچنە سەر بابەتەكە.

## دوو ئیمکان

چیرۆکەکە بەردەوامە. بەشی ٧ باس لە پەیداکردنی پادشای تازە لە ناو تەویلەدا دەکات. بۆ ئەوە بتوانیّ دوو چەشنە دارشتن بێتە خەیاڵەوە. هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵهێنە و هەر دووك دارشتن بەدەنگی بەرز و ڕوون و ئاشکرا بخوێنەوە. پاشان دەتوانن خۆتان بریار بدەن کە چ جیاوازییەك لە نێوان هەر دوو دارشتندا بەدی دەکریّ.

## تێکستی ماندووکەر

کەسێك لە ریزی پێشەوە جورئەت نیشان دەدا و دەرگا دەکاتەوە. کەسانێکی تامەزرۆ و وەشوێنی دەکەون. لە قولینچکێك ″ئاشین پۆتل″ی بچکۆلانە کە خۆی کۆ کردووەتەوە دەبیننەوە، کە ئێستا ڕووبەڕووی شادی و هەلهەلەی خەڵك دەبێتەوە.

ئەم دارشتنە کارێکی وا دەکات کە پشیلەیەك سەری خۆی بەناو تەلیسدا بکات. لێرە هەموو کێشەکانی ناو چیرۆکەکە بەفیرۆ دەروا. مەتەڵەکە دەکرێتەوە، پێش ئەوەی بیسەر بیری لیّ بکاتەوە.

## تێکستی پر کێش

کەسێك لە ڕیزی پێشەوە جورئەت نیشان دەدا و دەرگا دەکاتەوە. مقۆ مقۆ دەکەوێتە ناو خەڵك. کەسانێکی دی بەشوێن کابرادا دەچن. کەسێك لێرەیە؟ دەپرسن. پاشان بەدەنگێکی بۆڕەوە دەپرسن: کەسێك لێرەیە؟ لەناکاو لە پشت پشتەوە لە قوڵینچکێك چاویان بەتارماییەك دەکەویّ کە خۆی گرمۆڵە کردووەتەوە. خەڵکەکە باوەڕ بەچاوی خۆیان ناکەن: ئەوە دەبیّ پادشای تازەی ئێمە بێت؟ لێی دەچنە پێش، بەلاّم هێشتا ناتوانن باوەڕ بکەن.

لە پرێکا هووروژمی هەلهەلە و شادی دەتەقێتەوە. ئەم تارماییە

گرمۆڵەیە کەسێك نییە جگە لە "ئاشێن پوتل"، کە ئێستا کەوتووەتە ناو هەلهەلە و شادیی خەڵکەوە.

ئەم داڕشتنە لە ڕێگای خاڵی بێدەنگی و پرسیاری بێ وەڵامەوە، بیسەر دەخاتە ناو هەیەجانەوە. گەلێك درێژە پەیدا دەکات هەتا ناوی "ئاشێن پوتل" دەدرکێندرێت.

ئێستا جارێکی دی ئەم داڕشتنە دوبارە بکەوە. سەرنج بدەنە ئەو شوێنانەی کە بابەتەکە درێژ دەکرێتەوە و پرسیاری بێ وەڵام دێتە گۆڕێ، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە کێشی چیرۆکەکە لە کاتی پەیداکردنی "ئاشێن پوتل" دا لە ناو تەویلەی بەرازەکاندا باشتر بێتە دەستتان. هەوڵ بدەن ناوی پادشای تازە دواتر بهێنە سەر زمان. ئەمە گرینگترین ئەرکی وتارەکەیە.

چۆنییەتی داڕشتنی ئێوە دەبێت سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بەکارهێنانی بەجێی نیشانەکانی زمانی لەش دەتوانێ گەلێك یارمەتیدەر بێت.

تەمرینی نیشانەکانی لەش دەبێت بەردەوام بکرێت و ئەوەش لە بیرنەچێ کە بۆ باشترکردنی کاری وتاربێژی و وێژەری دایم دەبێت بگەڕێنەوە سەر ئەنجامدانی پرۆڤەی زمانی لەش، بۆ ئەوە کارەکەی ئێوە تەواو و کەماڵ بێت.

وانەی ١٠

# کۆڕی وتار

ئەو کەسەی لە بەرامبەر ڕای گشتیدا دەردەکەوێت، نابێ چاوەڕوانی چاو لێ پۆشین بی و نابێش داوای وا بکات. [ماری ڤ.ئێبنەر – ئێشن باخ]

گەلێك خەڵك دەیانەوێت بۆ هەموو شتێك گەرەنتییان هەبێت، بۆ ئەوە لە ژیاندا هەست بەئەرخایەن بوون بکەن. گەرەنتی کردنی وتاربێژ و وێژەرێك بەر لە کارەکە گەلێك ئەستەم و دژوارە. تەنانەت ئەگەر هەموو کارەکانی ڕێکخستن و تەکنیك زۆر بەباشی تاقی کرابنەوە و ڕێك خرابن، بەو حاڵە دەتوانێ گەلێك شتی چاوەڕوان نەکراو ڕوو بدات. کە ئەویش بێ دەسەڵاتییەکی گەورەیە.

## پەککەوتن

لێرە مەبەست گۆڕینی شێوەی نووسینی وتارەکە، یان بەکارهێنانی بەهەڵە ڕووناکی و یاخۆ لە بیرچوونی چاویلکە لەماڵەوە نییە. بەڵکو زۆرتر مەبەست ئەو پێشهات و وەزعەیە، کە لە شوێنی ڕووداوەکە دێتە پێش و چەوتی دەخاتە کارەکەوە.

### نموونەی ١

نموونەیەك ڕەنگە بابەتەکە ڕوونتر کاتەوە: وتاربێژێك بۆ پێشکەش کردنی وتارەکەی پێویستی بەبەشگەلێك لە فیلمی ڤیدیۆ هەیە. وتاربێژ بۆخۆی کاسێتی ڤیدیۆ لەگەڵ خۆی دەهێنی و بەڵێنیشیان پێ داوە کە دەستگای ڤیدیۆی بۆ ئامادە بکەن. دە دەقیقە بەر لە دەسپێکردنی وتارەکە بۆی دەردەکەوێت، کە کاسێتەکە و دەزگای ڤیدیۆکە بۆ یەکتر نابن، لەبەر ئەوەی ئەم دووانە دوو سیستەمی جیاوازیان هەیە.

لێرە ئەوە یارمەتی نادات کە بەشوێن گوناهکاردا بگەڕێی. وتارەکە دەبێ پێشکەش بکرێ، وتاربێژ دەبێت ئەرکی خۆی بزانێ و گۆڕان لە وتارەکەیدا پێك بهێنێ. بیسەران [بینەران] دەست بەچەپڵە لێدان دەکەن، لەبەرئەوە ٢٠ دەقیقە لە دەستپێکردنی کۆڕەکە لای داوە.

**نموونەی ٢**

وای دادەنێین، کە ئێوە دەتانەوێ وتارێك بەنیشاندانی ئیسلاید [دیا] پێشکەش بکەن، تۆزێك بەر لە دەستپێکردن لە کاتی ئامادەکردنی دەزگاکە، دەبینین کە ئێوە پێویستتان بەسیم (وایەر)ی درێژتر و جێگای دووشاخە (سەرەپلاك)ی زۆرتر هەیە.

## هاوکارێك بۆ ڕێکخستن

ئێوە وەك وتاربێژ و وێژەر ناتوانن ئەو شتانەی کە ناتەواون، بۆ کۆڕەکە دابینیان بکەن. ڕۆژێك بەر لە دەستپێکردنی کۆڕەکە، پەیوەندی بەو کەسەوە بگرن کە بەرپرسی بەشی تەکنیکە و ئاگاداری هەموو بەشەکانی شوێنی کۆڕەکەیە. ئێوە دەبێ ئەوەش ڕوون بکەنەوە کە ئەو کەسە لە کاتی کۆڕەکەی ئێوە خۆی لەوێ حازر بێ یا ئاسان پەیدا بکرێ. پێشتر خەمی ئەوە بخۆن کە کەسێك پەیدا بکەن کە بەرپرسیارەتی ڕێکخستن، تەکنیك، کاری ڕووناکی و باقیی کارەکان وە ئەستۆی خۆی بگرێ. ئێوە لە پەیوەندی لەگەڵ وتارەکەی خۆتاندا بەئەندازەی پێویست کارتان هەیە و دەبێت لەسەر کارەکەی خۆتان کۆنسێنتراسیۆن بکەن، دەبێ بینەران و بیسەران لە بەرچاو بگرن. کاری خۆتان تایبەت بکەن بە ڕێکوپێك کردنی ئەو بابەت و نووسراوانە کە کەڵکی لێ وەردەگرن. زۆرجار ڕوو دەدات کە وتاربێژ نازانێ کام وێنەی [ئەسلاید] لە کوێدا دێت. بەگوتنی ئەها، ئەوە هەمووی تێکەڵوپێکەڵە، داوای لێبوردن ناکرێ. ئەگەر ئێوە بۆخۆتان وێنەکانتان

تێکەڵوپێکەڵ کردبێت، نابێ لاتان سەیربێت ئەگەر وتارەکەتان سەرکەوتوو نەبێت. هەموو ئەو شتانەی لە دەرەوەی وتارەکەی ئێوە بێت کاری تەکنیکە، کە لە هەر حاڵدا دەبێت پێشتر تاقییان بکەنەوە.

## هەراو هوریای تێکدەرانە

چی دەکەن ئەگەر لە ناوەڕاستی قسەکردنەکەتاندا کەسێك لە ژووری پەناوە بەماشێنی دڕێل خەریکی کونکردنی دیوار بێت؟ ئایا پشوودان بۆ کێشانی سیغار ڕادەگەیەنی و قسەکانت دەبڕی و پاش کۆتایی پێهاتنی گرفتەکە درێژە بە وتارەکە دەدەی؟ ئایا وەك میوان و وتاربێژ، خۆت لە بەرامبەر کابرای کرێکاردا بەتەواوی بەرحەق دەزانی؟ ئایا پاش خۆماندوو کردنێکی زۆر، دەتوانیٚ خەڵکەکە بگەڕێنییەوە ئەو حاڵەتە کە پێشتر کارت بۆ کردبوو؟

ئاسانترین کار ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ بەو کەسەی کە بەرپرسی ڕێکخستنە و لە هۆڵەکەدایە و ئێوە پێشتر قسەتان لەگەڵ کردووە ڕابگەیەندریٚ بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە. ئەمە دەکریٚ بەمیکرۆفۆن یان بیٚ میکرۆفۆن ڕابگەێندریٚ: ”ئاغای...، ڕەنگە بکریٚ کە ئەو کابرایە بەسندووقێك بیرە ئارام کەنەوە؟!“

بۆ دانیشتووانی ناو هۆڵەکە گرفتەکە بەشێوەیەکی پڕ جەفەنگیات چارەی هاتووە، ڕێگا بۆ درێژە دان بەوتارەکە ئاواڵەیە. کەسی بەرپرس ئەرکی سەر شانیەتی ئەم گیروگرفتە بەشێوەیەکی بنەڕەتی چارەسەر بکات. ئەو نابیٚ خۆی بەوە ڕازی بکات کە کابرای ماشێن بەدەست، دەنگی ماشێنەکە کزتر بکات و بەردەوام بێت. ئێوە لە هەر حاڵدا پێویستتان بەکەسێکی وا هەیە کە بەرپرس بێت لە بەرامبەر ئەم شتانەدا بەر لە کۆڕەکە و لە کاتی کۆڕەکەدا.

## بەرپەرچدانەوەی کوتوپڕ

ئێوە تەنیا خۆتان بەرپرسی وتارەکەتان و بەرپەرچدانەوەکانی خەڵکن، کە وەك وەڵامدانەوە پێشکەشی دەکەن. لە ڕێگای وتارەکەتان و باوەڕمەندیی دەروونیی خۆتانەوە لە دەستتان دێ دانیشتووان و حازران بەڕێوەبەرن یا ئەکتیڤیان بکەن لە بەشداربووندا. ئەگەر وتاربێژ و وێژەرێکی باش بن، زۆر زوو دەتوانن ئۆتۆریتە بەسەر خەڵکەکەدا پەیدا بکەن.

## قسەی ناو قسە

گەلیك جار ڕوودەدا کە لە کاتی پێشکەش کردنی وتارەکەدا، کەس یان کەسانێك بەشێوەی جیاواز قسە بهاوێژن و گرفت پێك بێنن. بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە، ئێوە وەك وتاربێژ، ئیزنتان نییە خۆ تێکەڵ مەسەلەکە بکەن.

لە هەر حاڵدا ئەمە حاڵەتێکی ڕیزپەرە: لە پەیوەندی لەگەڵ وتارێك کە بەستراوەتەوە بەگفتوگۆ و پرسیار و وەڵام، دەبێ بەپێی قانوون ئیزن بدرێ وتاربێژ قسەکانی تەواو بکات. لە پەیوەندی لەگەڵ قسە هاویشتندا، دەکرێ سەرنج بدەینە ئەم گفتوگۆیەی کە لە خوارەوە دێت.

ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانە کە لە ناو هۆڵ یان لە دەرەوە بەرپا دەبن و ژمارەی بەشداران تێیاندا زۆرن کۆنترۆڵ کردنیان گەلێك دژوارە، هەر وەك چۆن لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا دەبیندرێ. لە کاتێکی وادا لە نێوان وتاربێژ و بیسەر [بەشداربوواندا] پەیوەندی هاوسەنگ نییە، ئەگەر وتاربیژ حەز لە گفتوگۆ نەکات، ڕەنگە ئەوە لەبەر نەبوونی کات بێت، کە لە ڕۆژێکدا لە چەند جێ قسە بکات، و یا ڕەنگە هۆ و سەبەبی تری هەبێ کە پەیوەندیی بەتێم و بابەتی وتارەکە و قسەکانەوە هەبێ.

ئەگەر لە کاتێکی وادا پرسیار هەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، ئەوە

وتـاربـیـژ دەبـێت چـاوەڕوانـی گـەلـێك پـرسـیـار بـێت کـە لـە ڕێگـای قسە هـاویشتـنـەوە بـێتـە پـێش، کـە وتـاربـێژ تـووشی بـەربـەرەکـانـی و خـۆڕاگری دەکات. ئەم قسە هـاویشتنانـە لـە نزمترین حاڵەتدا لـە هـاوڕەنگیی فیکرییەوە دێن، کە هـەڵگری ڕەخنەی ئـاواڵەن. ئەگەر وتـاربێژ پێی نەکرێ لەگەڵ ئەم قسە هـاویشتنەدا خۆی ڕابگرێ، ئەوە بەحیسابی لاواز بوونی کەسایەتی و پۆزسیۆنی ئەو کەسە دادەندرێ. لەبەر ئەم هۆیـانە ئێستا ئەو تەکنیکە کە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لـەگەڵ بەرپـەرچدانـەوەی کتوپڕە، بـاس دەکرێ، کە ئێوە نە تـەنیا لـە کاتی وتـار پێشکەش کردندا، دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن بەڵکو لـە ژیـانـی ئـاسایی و کاریشدا دەتوانن بەکاری بهێنن.

هێندێك لـە وتـاربێژان خۆیـان مـاتڵی قسەی نـاو خەڵك دەکەن تـەنـانـەت کەسانێك هـەر خۆیـان خەڵك هـان دەدەن، کە بەوجۆرە خۆیـان بکێشنە نـاو بـاس و خواسەوە، ئەوەش لای هـەموو کەس ڕوونە. کێ هـەیە ئیرەیی نـەبا و مـات نـەمـێنـێ لـە پـەلامـار قسەی هـێنـدێك لـە وتـاربـێژان. وتـارێکی کـە بـەحـەوسەلـە و خـەمـخـۆرانـە ئـامـادە کراوە لـە پـڕێکـا دەبـێتـە قسەکردنێکی تەواو زیندوو و پڕ ڕەنگ، دژکردەوە و بەرپـەرچدانـەوەیەکی لـە نـاکـاوی وتـاربێژ، کـارتێکردنێکی پۆزێتیڤی لـەسەر بیسەران دەبێت، تـەنـانـەت ئەگەر بیسەر خۆی لـە نـاو نـاوەڕۆکی وتـارەکەدا پـەیدا نـەکـات. چەند نموونـە لـە کـاری پراکتیکی بـەرپـرچدانـەوەی قسە پـەڕاندنی بیسەران دەتوانێ بەکەڵکی ئێوە بێت، جا خۆتـان بـەپێی گـەرمیی بـابـەتـەکە دەتوانن بـەکـاری بهێنن.

قسەی نـاو قسە: ئێمە پێویستمـان بـەپیـاوانـە

بـەرپـەرچدانـەوە: زۆر ڕاستـە، پـیـاومـان گـەرەکـە نـە وێنـەی بـەرئـاوەژوو [ڕاینێر بـارتێسل– دیموکرات مـەسیحـی] بـۆچـوونـی بیسەران: بـەپـەسند کردنی بەرپـەرچدانـەوەکە، پێ دەکەنن، لایـەنگری لـە وتـاربێژە.

لـە ڕێگای بـەرپـەرچدانـەوەیەکی کارتێکەری پێکەنین هێنـەر و هـەروەهـا

بەکاریکاتۆرکردن و مانای هاوبەش بەخشین لە نێوان پیاو و وێنەی بەرئاوەژوو و هەمیسان لە ڕێگای زەردەخەنەی وتاربێژ، سازدانی سەرلەنوێی دژایەتی لەم دەمەدا پووچەڵ دەکرێتەوە. بەرپەرچدانەوەیەکی وا پڕ هێز لە وەڵامی ئەم چەشنە قسە هەڵبڕینەدا جێگا بۆ شەڕە قسە ناهێڵێتەوە. وتاربێژ بەڕەسمی حەق دەداتە قسەکەی قسەهاوێژ، بەڵام دوایە بای دەمی دەگرێ.

لە حاڵەتێکی ئاوادا بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەهاوێژ باشتروایە هەردەم حەق بدەنە وتەی قسەکەر بۆ وێنە:

باشە،...-، زۆر ڕاستە...-، حەققتان هەیە...!

## زانیاری لە زەیندا [لە مێشکدا]

هەر وەك چۆن لە نموونەی دوایەدا دەردەکەوێ، بۆ وتاربێژێك کە باوەڕی بەخۆیەتی، ئەمبارکردنی زانیارییەکی زۆری سیاسی و مێژوویی لەسەر بابەتگەلی هەمەجۆر لە ناو مێشکدا کارێکی پێویستە. بۆ ئەوەی بەخێرایی بتوانرێ لەسەر بابەتگەلێکی دیار قسە بکردرێ و لە کاتی پێویستدا بیروڕا دەرببڕدرێ، دەبێ ئەو توانایە لە ڕادەیەکدا بێ کە وتاربێژ بەزوویی لە سندوقی زانیارییەکانی ناو مێشکی کەڵك وەرگرێ. بەرپەرچدانەوە دەبێ کورت و لە جێی خۆیدا بێت و تیرئاسا لەسەر خاڵ بنیشێ، بەڵام نابێ ئەم بەرپەرچدانەوە بکەوێتە حاڵەتی بەرگری کردن لەخۆ.

بۆ باسکردن لەسەر نمونەیەکی مێژوویی ئەم باسە بەسەر دەکەینەوە: لە مانگی ئاگوستی ساڵی ١٩٦١ لە کاتی سەدارەتی ئادرناوە [حزبی دیموکراتی مەسیحی] لە ناوەڕاستی شاری بەرلینەوە دیوار لە نێوان دوو بەشی شاری بەرلیندا، کێشرا. ٢١ ساڵ دواتر لە پەرلەمانی ئەڵمان ئەندامێکی پەرلەمان [سوسیال دیموکرات] ئەم قسانە دەکات. لە کاتی خوێندنەوەدا بیر لەم خاڵانە بکەنەوە:

* ئایا نوێنەری پەرلەمان، ئەو ڕووداوە مێژووییەیە لە جێدا و زوو بەوشەی بەجێ و ڕوون باس دەکات؟
* ئایا ئەو تەنیا بەرگری لە خۆی دەکا و بەم شێوە هەڵمەت لەسەر خۆی دەسەلمێنێ؟

نوێنەرێکی پەرلەمان [سوسیال دیموکرات] لە پەرلەمان هێندێك پێش گۆڕینی دەوڵەت لە ساڵی ١٩٨٢ دەڵێت:

## وتاری پەرلەمان

حاشا لەوە ناکرێ ئەوە دەستکەوتێکی مێژوویی سوسیال دیموکراسی و دیموکراتە ئازادە [لیبراڵەکان]، کە دژی پرۆژەی سیاسەتی دوو بەشکردن بوون، کە لە گەلێك لایەنەوە لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات پڕ سوود بوو و سوودی بەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دەگەیاند. لە ڕاستیدا ئەوە شۆڕشێك بوو– کە مرۆڤ دەتوانێ ئاسان دانی پێدابنێ– هەڵبەتە ئەو شۆڕشە تێکەڵ بەژانی لەدایکبوون بووە. ئەوە نوێ بوو کە مرۆڤ بۆ لای یەك ڕادەکێشران، نەئەوەی مرۆڤ لە یەك هەڵبڕێن، واتە گەڕان و لە یەك وەرگرتن. ئەوە گەورەترین هیوای ئەڵمانی دوو پارچە کراوبوو. ئەوە هیوایەك بوو کە نێوان ئەڵمانییەکان باشتر بکرێ کە مرۆڤ زۆرتر بەیەکەوە بن و پرۆسەی ئاسایی کردنەوە وەپێشی بخرێ″ قسەی ناو قسەی نوێنەری دیموکرات مەسیحی و سوسیال مەسیحی:

″دیوار و تێلدڕوو″!

وەڵام: هەر بۆیە ئێمە ڕێککەوتنامەی ڕۆژهەلاتمان مۆرکرد. ئێمە دوای بەڵێننامەی چوار زلهێز کۆمەڵە ڕێککەوتنمان بەست. من لەم پەیوەندییەدا، ناو لە ڕێککەوتنامەی ترانزیت دێنم، کە هاتن و ڕۆیشتن بۆ ناو بەرلینی گارانتی کردبوو. مرۆڤ دەبێ خۆی ئەوانە لە بەرچاو بگرێ...

### ڕەخنە

بەراوردی ڕێگاچارەی خۆتان بکەن بەلە بەرچاوگرتنی ئەم ڕەخنە و ڕوونکردنەوەیە، کاتی وەڵامدانەوە بەپرسیارەکە. وێ دەچێ وتاربێژ لەو دەمەدا زانیاریی مێژوویی لە زەیندا نەبێ، هەر بۆیە وەڵامدانەوە بەقسەی قسەهاوێژدا، دووچاری هەڵەیەکی بنەڕەتی دەبێت. ئەو بەرگری لە خۆی و ڕەفیقەکانی دەکات لە فۆڕمی ئێمەدا لە حاڵێکدا ئەو دەبوو قسەکە هەڵگەڕێنێتەوە بۆ کابرای قسەکەر و حیزبەکەی کە بەشدار بوون لە دوو پارچەکردنی بەرلین: بەڵێ، ڕاستە، ئێوە بوون...

دەبوو ئەم قسەی ناو قسەیە ببێتە هەلێك بۆ بەرپەرچدانەوەیەکی زلئاسا. بەڵام وتاربێژ هەر بۆ لای بەرپەرچدانەوە ناچێ، لەجیاتی وەڵامێکی توند و تیژ بەرگریکردنێکی درێژ دەکات.

### دارشتنی وەڵام

لە پەیوەندی لەگەڵ قسە و پرسیاری ناو قسەدا، کە لە ژێر کەمبوونی کاتدا دێتە پێش، سەرنج بدەنە ئەم خاڵانەی خوارەوە:

* هەڵەی بەرامبەرەکە لە کوێ دایە؟
* کەی دەکرێ بەرپەرچ بدرێتەوە بەگوتنی "تەواو ڕاستە..."

جارێکی دی، وەڵامی نوێنەری پەرلەمان بخوێنەوە کە دوور لە بیرکردنەوە بەئێمە دەست پێ دەکات:

"هەر بۆیە ئێمە ڕێککەوتنامەی ڕۆژهەڵاتمان پیك هێنا..."

لە کاتی قسەهاویشتنی ناڕەوادا، یەکدا بەدوو وەك هەورەتریشقە دەبێت وەڵام بدرێتەوە، بۆ ئەوە بەرپەرچی بیری هەڵەی بەرامبەرەکە بدرێتەوە. لە کاتێکی وادا دەبێت وا دەست پێ بکەن: تەواو ڕاستە، ئێوە...

ئێستا دارشتنی خۆتان بنووسن و پاشان لەسەر هەمان بنەما کار

بکەن. بەرپەرچدانەوەیەکی کورت و بەجێ و پڕ مانا دەتوانێ وا بێت:

قسەهاوێژەر: دیوار و تێلدڕوو!

بەرپەرچدانەوە: تەواو ڕاستە، کە لە کاتی دەسەلاتی دیموکرات مەسیحییەکاندا کێشرا!

کاردانەوە: شەرمەزاربوون و بێ دەنگ مانەوە.

لە نموونە خوارەوەدا، وتاربێژ، قسەی قسەهاوێژ وەك تۆپێك دەگەڕێنێتەوە بۆ کابرا. لێرە دەستپێك گوتنی ئێمە نییە، بەڵکو "ئەگەر ئێوە..."یە.

سەرۆك دەوڵەتی پێشووی ئەڵمان، هێلمۆت شمیت لە ١٩٨٢/٦/٢٤لە پەرلەمانی ئەڵمان لە کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەت لە بارەی دانیشتنی سەرانی ئابووری لە "وێرسا" دەڵێ:

### بەیاننامەی دەوڵەت

«... ئەوەی کە نابێ ڕوویداو، و ئەوەی کە لە ڕێگای وێرساوە لە لای ئێمەوە نابێ ڕوو بدات، ئەوەیە کە نابێ شەڕی تیجارەت لەگەڵ شورەوی بکرێ.

چەپڵە لێدانێکی بەهێز لە لایەن سوسیاڵ دیموکراتەکانەوە.

لەو ڕێگایەوە دەکرێ سەردەمێکی نوێ لە شەڕی سارد بێتە پێش

قسەهاوێژ: [دکتۆر ئالۆیس مێرتس، دیموکرات مەسیحی]: کێ ئەوەی دەوێت؟

بەرپەرچدانەوە: ئەگەر ئێوەش نەتانەوێ، کەوایە، دووەم شتی هاوبەشی نەتەوایەتیمان هەیە، ئەورۆ و سبەینێ ئاغای مێرتس...

وتاربێژ لەم وەلامەیدا، خاڵێکی گەلێك گرینگی لە بەرچاو گرتووە: لە کاتی پێشکەش کردنی وتاردا مرۆڤ ناتوانێ هەموو دەمێك سەرنجی لە

یەك داپچڕاوی بیسەران بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. کاتێك ئێوە ناوی کەسی بەرامبەرتان بێنن و ڕاستە و ڕاست وەڵامی بدەنەوە، هیچ بیسەرێك نییە کە سەرنجی بۆ لای قسەکان ڕانەکێشرێ. مرۆڤ خۆی لەگەڵ دژبەرەکەی پێناسە دەکات و بانگەوازی هاوکاریی بۆ دەکات و لەو حاڵەدا کابرا ناتوانێ خۆی بکێشێنێتەوە دواوە.

## بەرەوپیرچوون لە ڕێگای بەرپەرچدانەوەوە

پڕۆڤە خوارەوە نیشانتان دەدات کە چۆن بەرپەرچ بدەنەوە. تەنانەت ئەگەر نەتانەوێ وەك وتاربێژ لە کۆڕێکی ئاواڵەدا قسە بکەن، دەتوانن بۆخۆتان لە ژیانی ڕۆژانەتاندا کەڵکی لێ وەربگرن، کاتێك کەسێك بەقسە پەلاماری ئێوە دەدات. تا ئێرە دیتتان کە چۆن وتاربێژ وەڵامی قسەیەکی بێ جێ، ڕاستە و ڕاست، بێ پێچ و پەنا و دەستبەجێ، دەداتەوە. هەر بەو پێیە ئەو تەمرینەی خوارەوە ئەنجام بدەن.

وتاربێژێك ویستی بەپێی خاڵە لاوازەکانی بەرامبەرەکەی، لە گفتوگۆکەدا، وەڵامی بداتەوە، وەختایەك ئەم وشانەی بەکارهێنا، خۆی دووچاری شۆك بوو: بەڵێ، بەڵام ئێوە سوور دەبنەوە" بێ دەنگییەکی....

تێ بکۆشن خۆتان لە جێگای ئەو کەسە دابنێنن کە ئەم قسەیەی پێ دەگوترێ. ئەو بەرواڵەت ترسنۆك و بێ دەسەڵات دەنوێنێ، دەبێ ئێستا ڕاستەوخۆ بەرپەرچی بەرامبەرەکەی بداتەوە و سەرنجی بۆ خاویی خۆی ڕابکێشرێ. ئەگەر بکەوێتە ناو دەمەقرەکەوە دەبێ چاوەڕوانی قسەی بەردەوامی تر بێت.

بۆ بەرپەرچدانەوە هەر وەك پێشتر باس کرا لەو مێتۆدانە کەڵك وەربگرن: ئەگەر ئێوە...

وەڵامەکەتان لە پێشدا بەنووسراوە ئامادە بکەن، بۆ ئەوە پاشان بەراوردی بکەن لەگەڵ پێشنیاری ڕێگاچارە.

بەگژداچوون

وەڵامی خۆ ئەوە خەتای من نییە، کە سوور دەبمەوە، وەڵامدانەوە بەدەست پێ کردنی وشەی "من" بەرامبەرەکە، هان نادات بۆ بیرکردنەوە ر وستکوتی ناکات. بەپێچەوانە سوورتری دەکات لەسەر گوتنەکەی.

ئەم پێشنیارانەی خوارەوە باشتر کارتێ کردنیان دەبێت:

* ئەگەر ئێوە تۆزقاڵێك کوتە هەستێکتان هەبایە، ئێوەش سوور هەڵدەگەڕان

* ئەگەر ئێوە سووربوونەوەی کەسێك بەگرفت بزانن، ئەوە گرفتی خۆتانە نە گرفتی من.

* ئەگەر ئێوە ئێستا خۆتان لە ئاوێنەدا ببینن، گەلێك شتی دیکەتان وەبەر چاو دەکەوێ.

هەر وەك دەبینن ئەم چەشنە بەرپەرچدانەوەیە تەنیا بۆ یەك هێرش بەکاردەهێندرێ.

## قەبووڵکردن و ڕەدکردنەوە

بۆ ئەوە لە هەر حاڵداخۆتان بۆ بەرپەرچدانەوە ئامادە بکەن، دەبێ چەند پرۆڤە وەك نموونە ئەنجام بدەن کە قەبووڵکردنی "تەواو ڕاستە..." و تەواوکەرەکەی لە لایەن ئێوەوە بگرێتە خۆی. بۆ ئەوە دیسان لە نموونەی قەفەسەکانی مریشك کەڵك وەردەگرین.

... ئێوە دەبێ جارێك بچن و بەچاوی خۆتان ئەو مریشکانە ببینن. ئەوانە زیندەوەری بێ زمانی بێ گلەیین کە لە لایەن ئێمەوە دەچەوسێنرێنەوە بۆ ئەوەی ئینسان بەیانیان هێلکەی هەرزانی بێتە سەر مێزی بەرچایی. ئەگەر ئێوە ناتانەوێ مۆری "شت" لەو بەستە زمانانە بدەن و بەگیانلەبەریان دادەنێن– مەبەستم لە ڕوانگەی ئاینی مەسیحییەوەیە.

قسەهـاوێژ: مـامرگەل مەسیحی!

لـێرەدا دەکـرێ دووچـەشن وەڵام بـدرێتـەوە: مـامرگـەل مـەسیـحـی، تـەواو ڕاستە، هـەروەهـا ... یـان مـامرگەل مەسیحی، تەواو ڕاستە، و نە...

## ڕێگا چارە

ئەم بەرپەرچدانەوەی سەرەوە درێژە پێ بدەن و پاشان بەراوردی بکەن لەگەڵ ڕێگا چارەکە.

لە بەرپەرچدانەوەی یەکەمدا قسەی کابرا، دووبارە دەکەیەوە بۆ ئەوە بەدژی خۆی کەڵکی لێ وەربگرییەوە:

مـامـرگـەلـی مـەسیـحـی، تـەواو ڕاستـە، بـەڵام هـەروەهـا ئـینسانگەلـی مەسیحی...!

بـەپێچـەوانـە لـە بـەرپـەرچدانـەوەی دووەمدا، لـەگـەڵ دووبـارە کردنـەوەی قسەی قسەهـاوێژ، لە قسەکانی پێشووی خۆتـان کەڵك وەردەگرن: مـامرگەل مەسیحی، تەواو ڕاستە، و نە چەوساندنەوەی ئەو بەستەزمانانە!

لە هـەر دووك گوتندا وەك وتـاربێژ دەوڵەمەندانە وەڵام دراوەتـەوە.

## دەسەڵاتی قسەی ناو قسە

هێندێك جار پێویستە مرۆڤ ئەوەی لەبەر چاو بێت، کە بۆ خۆی چی گوتووە، بۆ ئەوەی بەبەرامبەرەکەی بسەلمێنێت کە بەبێ سەرنجدانە سەر قسەکانی، قسە دەکات. ئەمە کاتێك بۆ وتـاربێژ دەست دەدات کە لە لایەن هێزی زەینییەوە بەگوێرەی پێویست بـاش بێت. لە ئەم وتـارەی نموونە لە پەرلەمانی ئەڵمان لە پەیوەندی لەگەڵ بەکارهێنانی ڕاکێتی پرهینگ ٢ دەبـیـنـن کـە چـۆن لـە ڕێگـای قسەی نـاو قسەوە کـەسێك لـە کـۆنسێپت دەردەکـەوێ و چـۆن تـەواو خـۆی دەدۆڕێنـێ. هـەروەهـا سەرنـج بـدەنـە قسەهـاوێژ کە چۆن بەسەر وتـاربێژدا زاڵ دەبێ و ڕێگای دەربـازبوونی لێ

دەگرێ. پاش خوێندنەوەی وتارەکە دەبێ دەستبەجێ وەك وتاربێژێکی باوەڕبەخۆ، وەلام بدەنەوە، بۆ ئەوە قسەهاوێژ قسەی لێ ببڕێ و نەکەوێتە خەیاڵییەوە جارێکی دی هەڵکوتێتە سەرتان. ئەو تێکستەی خوارەوە بخوێنەوە و لە ژێر دێڕی یەکەمدا خەت بکێشە. ئەم دێڕە لە زەینی خۆتاندا ڕاگرن، بۆ ئەوە دیسان بگەڕێنەوە سەر قسەکەی خۆتان، ئەگەر قسەی ناو قسەیەك بێتە پێش. نوێنەرێکی دیموکرات مەسیحی لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەماندا کە لە نوامبری ١٩٨٣دا گیرابوو، لە پەیوەندی لەگەڵ ناتۆدا و تەیارکردنی ئاوا دەڵێ:

## شەڕە قسەی ناو پەرلەمان

ئەو کەسەی لە ڕۆژئاوا بڕیاری بۆ خودی خۆی داوە، لە کاتی پێویستدا باقیی ژیانی لە ژێر دەسەلاتی کۆمۆنیستەکاندا بباتە سەر، و بەمجۆرە ئامادە دەبێت، واز لە مەسیحی بوونی خۆی بێنێ و ببێتە ئاگرپەرست، هەر وەك چۆن دایم بەمن واگوتراوە، ئەو کەسە دەبێ ئەو پێشنیارەی من دوور لە چاوەڕوانی نەبینێت. ئەو کەسەی کە پڕ بەدڵ دەیەوێ پشتیوانی لە ئاشتی و لە ئازادی بکات، دەبی لێرە و ئەمڕۆ بڕیار بدات، بۆ ماوەی ساڵێك بچێتە ئەڵمانی ڕۆژهەلات، و لەوێ بژی، هەتا بەپێی باوەڕی شەخسیی خۆی یارمەتیی مافی مرۆڤ و ئازادیی مەسیحییەت بدات، هەتا باروودۆخی ژیانی هاوولاتیانی ئەڵمانی ڕۆژهەلات باشتر بکات. لە بەیانییەوە هەزاران کەسی بەجەرگی مەسیحیی ئەڵمانی ڕۆژئاوا، بتوانن– هیوادارم بەلانی کەمەوە،١٠٠٠٠ کەس بن– داوای ئیزنی سەفەر بکەن، و ئەگەر پێشیان پێ گیراو ئیزن نەدران، کە بەداخەوە بەحەتم وا دەبێ، بە لانیکەمەوە ئیزنی ئەوەیان بدەن کە لە ماوەی ٦ هەتا ٨ هەفتەدا سکالای خۆیان بەرزکەنەوە. هەردەم وایە، ئەگەر یەکێك گەرەکی بێ، بڕوا، ئەوی تریش وەشوێنی دەکەوێ.

قسەی ناو قسە [ئانێتا فۆلمێر –حیزبی سەوزەکان]: کەوایە لە خۆتانەوە دەست پێبکەن!

وەڵامی وتاربێژ: ″جورئەتتان هەبێ، بە لانیکەمەوە یەك ساڵ لە ژیانی شەخسی و مادیی خۆتان قوربانی بکەن – من قسە بۆ ئیدەئالیستەکان دەکەم، قسە بۆ جەنابتان ناکەم، خانم و ئاغایانی حیزبی سەوزەکان – ئەو کارەش بۆ خزمەتی کۆمەڵایەتی و بەرگری لە دیکتاتۆریی کۆمۆنیستی بکەن.

قسەی ناو قسە [دیتێر بورگمان/ حیزبی سەوزەکان] فەرموون بڕۆن بۆ ئەو بەر، ئەگەر ڕاکێتتان ناوێ!

وەڵام: ساڵێك خۆتان تاقیبکەنەوە، لەسەر ئەساسی ڕاستبێژیی شەخسیی خۆتان، بۆ دەرخستنی بەهێزیی بیروباوەڕەکەتان و پایەداریتان! ئامادە بن لە کاتی پێویستدا لەسەر بنەمای ڕێکخستنی خۆپیشاندانێکی ئاشتییانە بۆ ئاشتی ساڵێك بچن لە زیندان دانیشن!

## ئیمکانی بەرپەرچدانەوە

ئێستا وەڵامێك بۆ ئەم قسەی ناو قسەیە بنووسنەوە، و بۆ یارمەتیی خۆتان یەکەم دێر لە قسەکانی وتاربێژ وەربگرن. بۆ بەرپەرچدانەوە دەگەڕێنەوە بۆ قسەکانی خۆتان. ئەوە ڕاستە بۆ ئەو ڕستە لێك گرێدراوانە، گەلێك دژوارە کە لەو نموونەیەی ئێمەشدا وایە و دەستی ئینسان دەبەستێتەوە. لە کاتی بەرپەرچدانەوەدا حەتمەن ناوی قسەهاوێژ بهێنن و بەگوێیدا دەنەوە کە تەواو گوێی نەداوەتە قسەکانی ئێوە. بەم قسە بێ گومان پێش بەقسەهاویشتنی دوبارەی کابرا دەگرن.

ئەگەر ئێستا وەڵامی قسەهاوێژتان پەیدا کردووە، دەتوانن بەراوردی کەن لەگەڵ ئەم ڕێگاچارانەی خوارەوە.

تەواو ڕاستە، خانمی هاوکاری ئازیز، بەیەکەوە دەست پێ دەکەین!

ئەگەر جەنابتان، خانمی فۆلمێری هاوکار، باش گوێتان ڕاگرتبا بیگومان بۆتان دەردەکەوت ئەو قسانە ئێوە ناگرێتەوە: ئەو کەسەی لە ڕۆژئاوا بڕیاری بۆ خودی خۆی داوە، لە کاتی پێویستدا باقیی ژیانی لە ژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا بباتە سەر، و بەمجۆرە ئامادە دەبێت، وازلە مەسیحی بوونی خۆی تێبنی بۆ ئاوڕپەرستی، هەر وەك چۆن دایم بەمن گوتراوە، ئەو کەسە دەبێت ئەو پێشنیارەی من دوور لە چاوەڕوانی نەبینێت!

## پێشگرتن بە قسەی ناو قسە

هەر بەوجۆرەی کە فێربوون، دەزانن کە لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ پێشکەش کردنی وتارێکدا، بەتایبەت وتارێکی سەلمێنەر، دەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە چۆن لەگەڵ بەرامبەرەکەتان ڕووبەڕوو ببنەوە. لە هەموو ئەو کەسانەی کە ئۆپۆزسیۆنی ئێوەن، نابێ چاوەڕوانی ئەوە بکەن کە ئەوان خاستان بێژن. بەتایبەت ئەو کاتە کە خۆتان بەقسەکانتان هانیان بدەن. هێندێك جار ئەوە نیشانەی زیرەکییە، ئەگەر هێندێك ڕستە کە دەبنە هۆی هاویشتنی قسە لە لایەن بیسەرانەوە. فرێ بدرێن قسەی ناو قسە تا ئەو حاڵەتە گرینگن کە دەتوانن سەرکەوتنی وتاربێژ کۆتایی پێ بێنن.

لە سەردەمێکی سیاسیی زۆر گەرمدا کە کێ بەرکێی سیاسی لە شاری بۆن لە گۆڕێدا بوو، بەر لە گۆڕینی دەوڵەت لە سپتامبری ١٩٨٢، ئەم نموونەی. خوارەوە وەرگیراوە، کە وتاربێژ وەڵامی پێ نامێنێ بۆ قسەی قسەهاوێژ:

ویلی براند [سوسیال دیموکرات]:

هاوکار ئاغای کۆل، لە ئەندامانی پێکهاتوو لە دیموکرات مەسیحی و

سوسیـال مـەسیـحـی ئـۆپـۆزسیـۆنـی داهـاتـوو، نـابـێ پـێش وەخت شاگـەشکە ببـێ. شەرت نـیـیـە هـەرکـەسێك کـە تـونـد و تـیـژە لـەسـەر مـیـرات وەرگـرتـن، حـەتـمـەن پـێـی بگـات.

قسـەی نـاو قسە [هێلموت کۆل– دیموکرات مـەسیحی]: "ئـاغـای براند، کە وایـە دەبـێ میراتێك لە گۆڕێدا بێت!"

بێدەنگییەکی سڕکەر

قسـەی نـاو قسـە کە لە کۆڕی پڕ لە خـەڵکدا و یـان لە میتینگ و کۆبوونـەوە لـە هـەوای ئـازاد دا، زۆرجـار نـاگـاتـە گـوێـچـکـەی وتـاربـێـژ و قـسـەکـەر و یـان لـەبـەر دەنـگ و هـەرا قسـەکـەر نـاتـوانـێ حـاڵـی بێت، کـەوایـە چـۆن دەتـوانـێ وەڵام بداتـەوە. لـە حـاڵـەتـێکی وادا وتـاربـێـژ دەتـوانـێ چ هـەڵسوکـەوتـێ بکـات؟

بـەلـەبـەرچـاوگـرتنی ئـەوەی کـە ئـێـوە بـەجـۆرێك گـوێـتـان لـە قـسـەکـە بـووبـێت، دوو ڕێگا چـارە هـەیـە.

* ئێوە هـەر چەند بـەهـۆی دەنگەوە لـە قسـەی قسـەهـاوێژ حـاڵـی نـەبـوون، بـەو حـاڵـە کـوێرانـە، وەڵام دەدەنـەوە.

* ئێوە داوا دەکـەن کـە کـابـرا قسـەکـەی دوبـارە کـاتـەوە و لـەو مـاوەدا خـۆتـان بـۆ وەڵام ئـامـادە دەکـەن.

ئـەمـە بـۆچـوونـێکی شـەخـسـیـە و پـەیـوەنـدیـی بـەشـێـواز و هـەسـتـی وێـژەرەوە هـەیـە کـە ئـایـا بـەرپـەرچـی قسـەکـە بداتـەوە و قسـەکـەی بـەبـادا بدات و بـەدەستـی خـۆی قسـە و وتـارەکـەی خـۆی خـراپ بکـا و یـا دیسـان داوا بکـات کـە قسـەکـە دووبـارە بکرێتـەوە و وەڵام یـا ڕوونکردنـەوەی پێویست بدات بـەدەستـەوە. ئــەوەش دەکـــەوێــتــە ئــەســتــۆی وتــاربــێــژ خــۆی کــە کــام لــەو ئــیــمــکــانــانــە بـەکـاربـێـنـێـت یـان بـەکـارنـەهـێـنـێـت. بـەڵام ئـەوە ڕوونـە بـەداخـەوە لـە حـاڵـەتـی یـەکـەمـدا، سـەرکـەوتـن دەست نـاکـەوێ.

لـەم بـارەوە ئـەم نموونـانـەی خـوارەوە بخوێنـەوە.

قسەی ناو قسە لە کاتی کۆڕەکانی هەڵبژاردندا: [لەبەر زۆری بەشداران تێ نەگەیشت]

بەرپەرچدانەوە: لێ گەڕێن بابەکەیفی خۆی بقیرێنێ. وا باشترە، ئەو لێرە دەتوانێ باشتر بقیرێنێ هەتا ماڵەوە! [هێلمۆت کۆل– دیموکرات مەسیحی– سەرۆك وەزیرانی ئەڵمان] کاردانەوەی لایەنگرانی کۆل: قاقا پێکەنین.

بەکارهێنانی ئەم چەشنە ستیلە باشیی ئەوەیە کە وتاربێژ لە ڕێگای قسەی قسەهاوێژەوە لە چوارچێوەی قسەکانی خۆی دەرناچێ. لێرە پێویست بەوە ناکات بیر لە قسەکانی قسەهاوێژ بکاتەوە و دەرگای هەرچەشنە دیالۆگیش بەم شێوە دادەخرێ. عاقڵانە ئەوەیە کە لەسەر ئاڵترناتیڤی دووەم بمێنێتەوە، کە قسەهاوێژ قسەکەی دووبارەکاتەوە. ئەم ڕێگایە دەرفەت دەدات کە وتاربێژ باشتر قسەکانی خۆی بگەیەنێتە خەڵك. لە هەر حاڵدا ئەوە باشترە، کە ئەو ئینسانە قەبووڵ بکرێ و لە ڕێگای وەڵامێکی بەجێوە، چەوتیی قسەکانی ڕاست بکرێتەوە، نە ئەوەی کابرای قسەهاوێژ و قسەکەر مەسخەرە بکرێ.

## ئەو قسەی ناو قسانەی پەسند ناکرێ

پرسیاری تەیارکردنی ناتۆ لە نوامبری ١٩٨٣دا، یەکێك لە گەرمترین تێهەڵچوونەکانی پەرلەمانی ئەڵمان بوو. سەرنج بدەن چۆن وتاربێژ مامەڵە لەگەڵ قسەی قسەهاوێژدا دەکات.

## شەڕە قسەکانی ناو پەرلەمان

وێرنێر مارکس [دیموکرات مەسیحی]:

خانمان و ئاغایان، هاوکار ئاغای براند چاوەڕوان نەکراو لەگەڵ ڕاستییەکان ڕووبەڕوو دەبێتەو، ئەو لە ڕاستیدا دایم دژی تەیارکردنی نیزامی بوو، بەڵام وا دەردەکەوێ کە بڕیار درابێ کە بەو شێوەیە ئیمکانی

درێژە پێدانی دەستەڵاتی دەوڵەتی ئاغای شمیت پێك بهێنن. گەلی خانمان و ئاغایانی من، ئێوە دەتوانن لێرەوە ببینن، کە قسەکانی ڕێبەرایەتیی ئەم حیزبە بەڕاستی چەندە بایەخیان هەیە. هەروەها بیر لەوە بکەنەوە، کە بۆ لاوەکان، دایم دوو دڵن لە ڕاستبێژیی سیاسەتمەداران، ئەوە نیشانەیەکە بۆ بێزارییان– دووبارەی دەکەمەوە، ئەوە نیشانەیە کە  بۆ بێزاری– ئەم دوو دڵییە بەم شێوەیە دەسەلمێندرێ.

یورگن ڕێنتس [حزبی سەوزەکان]: چ شانسێك بۆ ئێوە [دەیبزێ] لە نێو لاواندا خۆشەویست دەبن! ئاغای مارکس، ئێوە سەرمەشقن بۆ لاوەکان!

گەلێك جار من لێرە دەنگی قەرەچی دەبیستم، بەڵام تکاتان لێ دەکەم تێ بگەن: من ناتوانم خۆم بەقسەلۆکی بێ مانا، لەوەش زیاتر شتگەلی زەینی نزم خەریك کەم...

من کەسێکم کە هێشتا شەش برین لە لەشم دایە و٩٠٪ زەرەرمەندی شەڕم، و لە پراکتیکدا دەزانم، کە شەڕ چی لە پاش خۆی لە لایەنی مادی، مانەویی و ئەخلاقییەوە بەجێ دەهێڵێ.

دیتێر بورگمان [حزبی سەوزەکان]: ئێمە لە دەرەوە فێری بووین

من نازانم، ئێوە ئەو جورئەتە لە کوێوە دەهێنن، کە لەم دەمەدا ئەو قسەلۆکە دوور لە پسپۆڕییانە بڵاوکەنەوە...

نموونەیەکی دی هەر لەو شەڕە قسەیەدا:

یورگن تۆدێن هۆفەر [دیموکرات مەسیحی]:

سیاسەتەکانی پاراستنی ئێمە، سیاسەتەکانی بەرگریی ئێمەیە.

بۆڵەبۆڵی سەوزەکان.

خانمەیل و ئاغایان، من دەبێ ئێستا جارێکی دی کۆڵێك ڕوونکردنەوەی شەخسیتان بۆ باس بکەم، کە سەوزەکان، ئەنجامی دەدەن. ئەوان لێرە

خۆیـان بـەنوێنـەری لایـەنگرانـی جووڵانـەوەی ئـاشتـی دەزانـن. لـە مـاوەی یـازدە ساڵـی ڕابردوودا کە وەك نوێنەر لـەم ماڵەدام تـا ئێستا قسەی نـاو قسەی ئـاوا دوور لـە ئـاشتیم لـە هیچ قسەکردنێکی نـاو پـەرلـەمـان نـەبیستووە. من تـا ئێستا قسەی ئـاوا دژی ئـاشتیم وەك ئـەو قسانـەی جووڵانـەوەی ئـاشتـی نـەبیستووە.

چەپڵـەڕێزانی دیموکرات مـەسیحی و سوسیال مـەسیحی و لیبرالـەکان/ بۆڵـەبۆڵی سەوزەکان.

لـەبـەر قیژە و هـەرای ئێوە نـاکرێ قسە بکرێ. ئـەو قسانـە کە ئێوە دەیـانکەن وەك تیرۆرەو لایـەقی پـەرلـەمـانی ئـەڵمـان نییـە.

ئۆتۆ شیلی [حیزبی سەوزەکان]: بۆچی، ئێمە تـەواو بێدەنگین و گوێ دەدەین

## چۆنییەتی کارکردن

ئـەو دوو تێکستـەی سـەرەوە، دوور لـە لێکدانـەوە لێرە هێندراون. هـەردووك تێکستـەکـە، جـارێکـی دی لـەگـەڵ هـاوکـارەکـەتـان بـیـخـوێنـەوە و دەورەکـان دابـەش بکـەن و هـەوڵ بدەن کـارەکـەتـان وابـێ کـە هـەست بکـەن خـۆتـان لـە نـاو بـاسـەکـەدا دەبینن. بـۆ ئـەو کـارە لـە هـەمـوو ئیمکـانـەکـانـی خـۆتـان میمیك، زمـانـی لـەش و دینـامیك کـەڵك وەربگرن و بـەکـاریـان بێنن، کـە لـەو بـەشـەی کتێبـەکـەدا فێری بوون.

## لە کۆرسی ئاخافتنەوە هەتا مەیدانی بەکارهێنان

لـە ڕێگـای کـار و ئـەنجامدانـی ئـەم کـۆرسـەی [ڕێتۆریکەوە] ئێوە لـە دوو لایـەنـەوە یـارمـەتـی دراون. لـە لایـەکـەوە ئێوە بوونـەتـە وتـاربێژ و وێژەر و قسەکـەرێك کـە دەتـوانـێ لـە ڕێگـای وشـە، مـیـمـیك و زمـانـی لـەشـەوە، بـاوەڕمـەندانـە بیروبـاوەڕی خـۆی دەرببڕێ، لـە لایـەکـی دی لـە ڕێگـای کـار

لـەگـەڵ هـاوکـارەکـەتـان و گـرووپـەکـەوە فـونـکسیـۆنـی ئـاکتـیـڤ بـیستـن [گـوێگرتـن]، ڕەخنـەگرانـە گوێگرتـنـتـان بـەکـارهـێنـاوە. لێرەش دەبـوو ئـەو کارامـەیییە پەیدا بکەن، کە بیسەر بن و ئاکتیڤ هاوبیری و هاوڕایی بنوێنن، ئاکتیڤ بن لە مامەڵەکردندا.

ئـەم کـتـێبـە ئـێوەی لـەو ڕێگـایـەدا وەك مـامـۆستـا و قـوتـابـی هـەتـا ئـەو جێگایەی کە ڕێگاکان لە یەك جیا دەبنەوە. هاوڕێتان بوودوایە شاگردەکە دەبێ بۆخۆی هێز و توانای خۆی بەکاربێنێت. ئەگەر ئێوە کورسەکەتان تەواو کردبێت، بوونەتە خاوەنی گەلێك زانیاری، کە بۆ کارکردن وەك وتاربێژ و قسەکەر و وێژەر بەکەڵکتان دێت. هەنگاوی پاشان ئەوەیە کە ئێوە بەو شتانەی کە لە کورسەکەدا فێریان بوون چی بکەن و چ ئامانج و هیوایەك لەبەر ڕێتان بێت لە داهاتوودا.

دەبێ لاتان سەرنجڕاکێش بێت، کە لە هەر بەشێکدا چیتان بەدەست هێناوە. تواناییی ئێوە لەبەر دەستتان دایە و لەم ڕستانەی ویلیام فۆن هومبۆلدتس خۆی دەنوێنێ: تواناییی مرۆڤ گەلێك زۆرە، ئەگەر مرۆڤ باوەڕی زۆری بەخۆی هەبێ

ئەم وتەیە (باوەڕی- زۆرت- بەخۆت- هەبێ)، دەبێ لە ڕێگای ئەو کورسەوە بەئێوە درابێت. دووەم ئەوەیە کە وتارەکەی ئێوە دەبێ ڕاستبێژانە بێت. سەرئەنجام سێیەمین شت ئەوەیە کە لە یادی بیسەر و گوێگردا بن، دەبێ کردەوەکان لای خەڵك بمێنێتە کە لە قسەکانەوە سەرچاوە دەگرن، نە بەتەنیا قسەکان!

مانگی گوڵان ٢٧٠٤ [٢١ی ئاوریلی ٢٠٠٤] کوڵن ئەڵمان

## پێڕست

**وانەی ٣**



**وانەی ٤**

**وانەی ٥**

**وانەی ٦**



**وانەی ٧**

**وانەی ٨**



**وانەی ٩**



**وانەی ١٠**